# چارە

ژمارە ٢١

www.chare-mag.net





دیدێکی نوێی چارەسازە

سەرکەوتن بەدەست بهێنە

## لێکنەگەیشتن گرفت دروست دەکات

## خەرجی چاوی ملیاردێرێکی یابانی و عەقڵی دانایەك!

## واقیعی مرۆڤ بە ئاسانی ئاشکرا دەبێ

## بۆچی کەناڵەبینراوەکان کوشتار زیاد دەکەن؟



## دانیشتوانی گوندەکانی کوردستان ماستی تورکی دەخۆن!

## لە بری ژەمێک ماسی فێرە ماسی گرتنم بکە

# کێشە چییە؟

* لەو ڕۆژانە چوومە سەردانی خزمێکم لە گرتووخانەی ناوەندی هەولێر، لەسەر سەرەی چوونە ژوورەوە دوو پۆلیس کە لەسەرەکە وەستابوون لە گەڵ هاوڵاتییەک بووە دەمەقاڵێیان و ئەگەر پاسەوانەکانی ئەوێ ڕۆڵیان نەبینیایە ئەوانیش دەکەوتنە بەندیخانە.

* ئەوەم هاتەوە یاد هەر لەسەر سەرە لە سەفەرێکم بۆ ئەوروپا چۆن کچەکەی سەر کاوەنتەر گوتی: ئەوانە کێوەڵینە، چونکە پەیڕەوی نیزام ناکەین!

* گەورەترین گرفت ئەوەیە مرۆڤ خۆی نەناسێ و نەزانێ ئەو ئەرکەی لە سەریەتی چییە.

* زۆرجار ئەو مرۆڤە بێ هێزی خۆی لە تەسلیم بوونی بە هەندێ وردە کێشە ئاشکرا دەکات.



* منداڵ کە تووشی گرفتێک دەبێ دەگریێ، ئەوە نیشانەی بێهێزی نییە، بەڵکو جەستەی پێنەگەیشتووە! بەلام گەورە کە تووشی کێشەیەک دەبێت ئەگەر گریا نیشانەی بێ هێزییەتی، ئەگەر دابمێنێ نەخۆشە! بەلام کە کۆڵی نەدا.. چۆک بە کێشەکە دادەدات.

* جارێکیان بیرم کردەوە، چ کێشەیەک کاریگەریی خراپی لەسەر بەرهەمی ئەرکەکانم هەبووە، تا لە نێو ئەو هەموو کێشەی کە هەیە چارەسەری لۆ بدۆزمەوە، زۆر بیرم کردەوە، ڕاڕا بووم، تا خەو بردمیەوە، وەلامەکەم وەرگرت کە هۆگریمانە بە خەوتن.


سەرنووسەر

* ئەو ڕۆژەی لە گەڵ چەند هاوڕێیەکم دەعوەت کراین، ئەوەندە خواردنیان لە پێش دانایین، کە چوار بە قەد ئاستی گەدە بەدەر بوو، لەر ئەوەی بەناچاری زۆرم خوارد دیسان لەوێ خەو بردمیەوە.

* گێڕایانەوە لە مەکتەبێکی سەرەتایی، منداڵێک گوایە دەرزی ئاژنین دەکات دەستی دە منداڵ بریندار دەکات!

* ئەوەی بەچاوی خۆشم دیتم، پێنج منداڵ شمشێریان لەدار دروستکردبوو، بەشەڕە شمشێر تەقلیدی کاک جومونگ و جەماعەتەکەیان دەکرد.

* من دەپرسم ئەگەر ئەوانە کێشە نەبن کێشە چییە؟

# چارە

دیدێکی نوێی چارەسازە

نرخ: ١٥٠٠ دینار

گۆڤارێکی ڕۆشنبیرییە، تایبەتە بەبنیاتنانەوەی مرۆڤ، مانگی جارێك لەهەولێر دەردەچێت ژمارە (٢١) حوزەیرانی ٢٠١٢













خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر:

**کاروان محمد**

Mob: 0750 447 21 31

E-mail: karwanchare@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین:** گەیلان ڕەزا

E-mail: gaylan.chare@yahoo.com



**نەخشەسازی:** ئەبوبەکری مەلا عەبدوڵڵا - **سەرپەرشتیاری چاپ:** نەهرۆ مەحمود

**ناونیشان:** هەولێر- شەقامی پیشانگاکانی ئۆتۆمبیل

**تیراژ:** (١٥٠٠) دانە

www.chare-mag.net

# خەمی منداڵەکانی سەرشەقام

باوکی داهێن

بە هیچ جۆرێک بووە کە منداڵ بە سواڵکردن داهێنەر دەرچێت؟ دیارە منداڵ پاکترین توێژە لە کۆمەڵگەدا و لەبیرمان نەچێت سروشتی منداڵ وایە کەوا پێویستی بە چەندین جۆر یارییەکە و نابێ بێبەش بێت لە ئارەزووەکانی، چونکە ئەمە کاریگەری لەسەر دەروونی دروست دەکات، ئەگەر سەیری جەستەی مرۆڤ بکەین دەبینین پێویستی بە چەندین جۆر لە ڤیتامین هەیە کە دەبێ بۆی دابین بکرێت، کەمتەرخەمی لە وەرگرتنی دەبێتە مایەی کەموکوڕی لە لەشی و دەبێ بەگوێرەی پێویستی لەشی وەریان بگرێت بۆ بنیادنانی جەستەیەکی تەندروست.

شەوێک لە ترافیک منداڵێکم بینی لەسەر شۆستەکە خەوی لێکەوتبوو! کیسەکانی شەعربەناتەکەی لە تەنیشت خۆی دانابوو، منیش بانگی هاوەڵەکەیم کرد و لێیم پرسی ئەو منداڵە بۆچی لەوێ خەوتووە؟ ئەویش گوتی: باوکی پێی گوتوە تا هەمووی تەواو نەکەیت نەیەیتەوە ماڵ! ئەوکاتێش کاتژمێر ١١ ی شەو بوو!

ئەو باوکە دەبێ خۆی چی بێ شەو منداڵەکەی لە هیلاکییان لە دەرەوە بخەوێت و نەتوانێت لە ترسی باوکی بچێتە ماڵ و لەسەر شەقامەکان بخەوێت؟

دەپرسم ئەو منداڵە پێویستی بە یاری نییە؟ پێویستی بەوە نییە شەوان لە ماڵ بێت و لە لای دایک و باوکی بخەوێت و لە ژێر سێبەری ئەوان ئارام بگرێت، تاکو ڕۆژانە ئامۆژگاری پێویستی بکەن بەڵکو ئەو منداڵە کەسێکی ڕێکوپێکی لێ دەربچێت.

کەوتمە بەدواداچوون بۆ منداڵەکە تا باوکیم دۆزییەوە، دەرچوو دوکانێکی هەیە، لەگەڵی کەوتمە گفتوگۆ، لێم پرسی: گوزەرانت چۆنە؟ گوتی لە خوا بە زیادبێ خۆم بە ڕۆژ دوکانداری دەکەم بە شەویش منداڵەکانم کار دەکەن! لێم پرسی لە کوێ کاردەکەن گوتی: گرنگ نییە لە کوێ کار دەکەن گرنگ ئەوەیە شەوان پارەی دێننەوە، هەروەها چاویشیان دەبێتەوە!

لێم پرسی بە ڕۆژ منداڵەکەت چی دەکات لەبەرچی بە شەو کار دەکات؟ گوتی: چاویان دەبێتەوە و کەس ناتوانێت فێڵیان لێ بکات! دووبارە پرسیارەکەم ئاراستەی کردەوە، لە وەڵامدا گوتی: شەوان لەسەر شەقام (شەعرلبەنات) دەفرۆشێت، گوتم باشە ئەوان فێڵیان لێ ناکرێت! ئەی ئەوان فێڵ لە کەس ناکەن؟ گوتی چۆن؟ گوتم من لە زۆربەی منداڵەکان دەپرسم بۆچی بە شەو کار دەکەن؟ دەڵێ: ن باوکمان نییە و بە ڕۆژ دەخوێنین بە شەویش کار دەکەین، منداڵی تۆش یەکێکن لە و منداڵانە! رووی پرسیارم ئاراستەکردەوە: کاتێک کە منداڵەکانت شەوان پارەت دەدەنێ چی دەڵێ: ی؟ گوتی: دەڵێم: کوڕم پارە هەموو شتێکە و دەتوانن بە پارە هەموو شتێک بکڕن! بەختەوەربن.

گوتم: ئەوە فێڵە لە منداڵەکەت دەکەیت، منداڵەکە فێرە فێڵکردن دەکەیت، پرسی چۆن گوتم وەکو پێش کەمێک پێم گوتی دەڵێ: باوکم نەماوە! کەچی وانییە، ئەوە یەکەم شت فێرە درۆ بوو، پاشان خەڵک هەیە باوەڕ دەکات و پارەی دەداتێ لەبەر ئەوەی خۆی بە بێ باوک نیشان دەدات، بەمە دڵیان بۆ دەسوتێ و پارەی دەدەنێ و دەڵێ: ن قەیناکە شەعربەناتەکەشمان ناوێت! لێرەش فێرە سواڵکردنیش بوو.

ئینجا شەڕکردن لەسەر شەقامەکان، منداڵەکان حەزیان لە یاری کردنەو شەڕەشەق لەگەڵ هاوڕێکانی دەکات، لەم ناوەش جوێن بە یەکتر دەدەن، ئەمانەو چەندین خاڵی خراپی تر دەرەنجامەکانی بەرەڵاکردنی منداڵە بەسەر شەقامەکان، سواڵیان پێ دەکرێت، هەر ئەو منداڵە درۆ لەگەڵ دایک و باوکی دەکات، چونکە ئەو نەریتە هەڵەیە بۆیە دەبێ باجەکەی بدرێت.

باوکی ئەو منداڵە گوتی: کوڕەکەم منداڵە هەموو شتەکی بە چاوی خۆی دەبینی بەوەش داهێنەر دەردەچێت! ئەی ئەوە نییە بە ڕۆژ دەخوێنێت، لێرە دا دەپرسم منداڵێک ئەوە نەریتی بێت دەبێ ئەگەر ببێ بە هەر شتێک لە دوارۆژ چی لێ دەرچێ و چی لێ چاوەڕێ بکرێت؟ جا مامۆستا بێت یان دکتۆر قەساب یان هەر شتێکی دی، ئەوا هەر نەخۆش دەردەچێت، چونکە ڤیتامینەکانی پەروەردەی بە شێوەیەکی تەندروست بۆ نەچووە و وەک پێویست نەبووە.

چۆن بۆ خاوێنی و جوانی ژینگە دار دەچێنین و ڕووبەری سەوزایی زیاد دەکەین، ئەگەر بمانەوێت کۆمەڵگەکەمان پاکوخاوێن بێت ئەوا دەبێت پەروەردەیەکی جوانی منداڵەکانمان بدەین، شتی جوان لە مێشکیان بچێنین، تاکو لە خراپەکاری دوارۆژی پیشەی ئەو منداڵانەی کە گەورە بووینە خۆمان بپارێزین، منداڵەکانمان بێ ئومێد نەکەین و جوان پەروەردەیان بکەین و بەرەڵایان نەکەین.

بۆیە پێویستە بە منداڵەکانمان بڵێین ڕۆڵە: دار پرتەقاڵ جوانە پرتەقاڵمان دەداتێ.. مەڕ جوانە شیرمان دەداتێ.. بولبول جوانە خۆشیمان دەداتێ.. شێر ئازایەتیمان دەداتێ.. چیا خۆڕاگریمان دەداتێ، ڕۆژ روناکیمان دەداتێ، ئەستێرە ئاسمان دەڕازێنێتەوە.. ئێوەش کە گەورە بوون بەو شێوەیە بە ڕەوشتە جوانەکانتان هەموو ئەو شتە جوانانەمان بدەنەوە، تاکو بە جوانی سەیر بکرێن.



# چۆن منداڵ فێری گوێڕایەلی بکەین؟

رابەر قادر

ئەوەی لەژیانی منداڵدا دەبینرێ زیاتر پەنا دەبردێتە بەرلێدان بۆ کۆتایی هێنان بەخواستەکانی، دایک و باوک بەتایبەت کە رۆژانە روبەڕووی چەند هەڵس و کەوتێکی تازە دەبێتەوە لە منداڵەکەی کەجیا لە چوار چێوەیەی ویستی دایک و باوک کەدەبێ منداڵ (بێدەنگ بی، کەم جووڵە، زۆرخواردن، زۆرنوستن، قسە گەورە بێت...) لەلای ئێمە بۆ ئەوەی منداڵ بێتە سەر ویستی دایک و باوک پێش گفتو گۆ هاتنە سەرخۆی باری ئاسایی منداڵەکە و قەناعەت هێنان بەمنداڵەکە یەکسەر بەزمانی لێدان گفتوگۆی لەگەڵ دەکرێت، لامان وایە لێدانەکە ئاسانترە و ماندوو بوونی ناوێ، بەلام لەڕاستی دا ئەو هەستەی دایک و باوک پاش کەمێک دوای لێدانەکە دەیانگەێنێتە ئازارێکی زۆری دەروونی، راستە هەوڵدان بۆ ئەوەی منداڵ قەناعەتی بێت، جاری واهەیە ئاسان نییە، بەلام ئەگەر دایک و باوک زۆرماندوشبوو بۆ ئەوەی قەناعەت بەمنداڵی بهێنێ ئەوا هەرزوو دوای کەمێک دایک وباوک لەدەروونی خۆیان دا زۆر هەست بەئارامی و دڵخۆش بوون دەکەن، گریمان منداڵ بەلێدان فێرکرا ئەی کە گەورەبی چی لێدەکەی؟ دەڵێن: ئەگەر بیگری بەشیری زۆر زەحمەتە وازی لێبێنی بەپیری، ئایە ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی کە گەورەش بوو شت بەقەناعەت وەرنەگری تەنها بەترس نەبێ، باشتر نییە منداڵ وا لێ ڕابهێنرێت کە گوێڕایەلیی بەقەناعەتەوە بۆوەی دروست بکەین؟ تاکو کە گەورەش بوو قەناعەت زیاتر کاریگەریی لەسەر هەبێت، ئایە بەو شێوەیە گەورەیی هەست بەرزی ناگەڕێتەوە بۆ منداڵەکەت؟ نابێتە هۆی ئەوەی کە چاو نەترس و ئازابێت، ئایە هەر ئەوەش نییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە گەورەش دەبێت لە گەڵ نزیکانی خۆی و دەوروبەری زیاتر هەوڵ بدات بەرامبەری خۆی رازی بکات بەخۆشەویستی و بەلێبوردەیی، نەک بەترس، بۆیە لەو باوەڕەین هیچ کات گوێڕایەلی سەرکەوتنی بەخۆە نەبینیوە بەترس، بەڵکو بە پێچەوانەوە گوێڕایەلی بەخۆشەویستی بەردەوام دەبێ، خۆ شە و یستیش بەباوەڕ بە یەکتر بوون دەبێ.



# ئیرادە چارەسەرە

محمد نبی

هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە هەموو کۆمەلگەیەک بەدەم کێشە و گرفتی تایبەت بەخۆی دەناڵێنێ، جا لەهەر روویەکەوە بێت، کە لە ئەندێشەی تاکەکەسدا چەکەرەی کردووە(نابەرجەستەیە)، وەلێ کەسەکان ناتوانن بەسەر بچووکترین کێشە و گرفتی رۆژانەیان دا زاڵ ببن، مەگەر کەسانێک بن خاوەن ئیرادەیەکی بەهێزو لەبن نەهاتوو بن، نەخاسمە بگرە رۆژانە چەندین رووداوی جۆراو جۆر روودەدەن کەچی سەرەنجامەکەی پەشیمان بوونەوەی لەدواوەیە، وەک کورد وتەنی(پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت) ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە لەڕووی زمانەوانییەوە (مشکلە) لە زمانی عەرەبی لە وشەی (شکو)ە هاتووە کە لەبنەڕەتدا(مشکوە) کە پیتی (واو)ەکە بووەتە (ألف) بەمەش ماناکەی دەگۆڕێت واتە (دەلاقە).
گرفت و کێشەی هەرتاکێک لەم چاخەی ئێستا کە بە چاخی تەکنەلۆژیاو پێشکەوتن ناسراوە و کێشەی کۆمەلایەتییە یەک لەدوای یەکەکانن، کە ئەمەش وایکردوە خێزانێکی لێکترازاوو کۆمەلگەیەکی دواکەوتوو و نەخۆش سەرهەڵبدات، سەرەنجامەکەی ماڵوێرانی بۆ خودی ئەو کەسەیە کە بەدەم کێشەو گرفتەکە دەناڵێنێ ئەمەش لەئەنجامی لێک تێنەگەیشتنێک یا قەبوڵنەکردنی ڕایەکی جیا لەگەل بوونی گرفتی دەروونی، من بەوپەڕی متمانە بەخۆبونەوە دەڵێم هیچ مرۆڤێک نییە خاوەن کێشەو گرفتی دەروونی نەبێت زەنگین بێت یا گەدا، سروشتی مرۆڤ وایە کە پەروەردگار دروستی کردووە، چ لە ناخەوە بێت یاخود بە پێچەوانەوە بەدەم کێشەیەکی بچوک دەناڵێنێ، وەلێ هۆکارگەلێکی تر هەن بۆ بوونی ئەم گرفتانە لە ڕووی خێزانییەوە کە کاریگەریی ڕاستەوخۆ و نەرێنی لەسەر تاکی خێزان و کۆمەلگا دەکات، بەپلەی یەکەم بوونی کێشە کۆمەلایەتیەکان لەم زەمەنەی کە تیایدا گوزەر ئەکەین کێشەی نەبوونی دارایی خێزانە کەسەرچاوەی بژێوی و داهاتی بنەڕەتی خاووخێزانی هەرتاکێکە، گرفتەکان لەبن نەهاتوون نەک هەر لای مرۆڤ بەڵکو لای زیندەوەرانی تریش جگە لە مرۆڤ سەرچاوەی هەموو ئەم پەیوەندیانە چ ڕاستەوخۆ بی یا بە پێچەوانەوە پەیوەندییەکی هەرەمەکی و سالارییە.

# ئەجنەبیەکە چی بە پۆلیس گوت؟

کاوە محمد

دیارە هەموو کارێک بە یاسا دانراوە، هەرکاتێک یاسا کاری پێ نەکرێ ئەوا فەوزا دروست دەبێت، بۆیە یاسا زەرورەتی ژیانی رۆژانەمانە پێویستە کاری پێ بکرێت، هەر کاتێک کار بە یاسا نەکرێت باجی پشت گوێ خستنی یاسا دادەنێین، یەکێک لەو یاسایانە یاسای هاتوچۆیە.
بەداخەوە تاکو ئێستا وەکو پێویست کاری پێ ناکەین، ئەویش هۆکاری پابەندنەبوونە، کە پەیوەندی بە هەموومانەوە هەیە هەر لە پۆلیس و شوفێر تا هاوڵاتیان.
لە ساڵی ١٩٦٩ ئەوکاتە شەریکاتی ئەجنەبی لە عیراق کاریان دەکرد، رۆژەکیان یەکێک لەو ئەمنیانە بە سەیارەی خۆی بەسەر شۆستە دەکەوێت، پۆلیس رێگەی لێ دەگرێت پێی دەڵێ: ئەوە جادەیە بۆ بەسەر شۆستە دەکەوی؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: ببورە من دەزانم شۆستە شوێنی سەیارە نییە بەڵام ئێوە بە منتان گوت جێگای سەیارەیە، پۆلیسەکە گوتی: چۆن؟ ئەویش ئیشارەی



بۆ ئەو هاوڵاتیانەدا کرد کە لەسەر شەقام دەڕۆن، گوتی: گەر شۆستە جێی سەیارە لێ خورین نەبێت بۆ هاوڵاتیان لەسەر شۆستە نارۆن؟ کەچی لەسەر جادە دەڕۆن ئێوەش لێ پێچینەوە ناکەن، کەواتە ئێوە بەمنتان گوت شۆستە شوێنی سەیارە لێخورینە.
بە راستی یەکێک لە دیاردە سەیرەکانی تر ئەوەیە ماتۆڕ و هاوڵاتی هیچ پابەند نابن بە یاساکانی هاتوچۆ، زۆرجار رووداوی دڵتەزێنی لێ دەکەوێتەوە، سەیرەکە لەوەدایە کاتێک گڵۆپی سور پێیە ماتۆر ناوەستێ بە بەر چاوی پۆلیس لە بەینی سەیارەکان دەردەچێ، پێم سەیرە ئایە ئەوانە بە ئینسان دانانرێن لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێت؟ چونکە کە کارەساتێ روویدا ئەوەی ناو سەیارەکەو سەر ماتۆرەکە هەر دوو ئینسانن، بۆچی بۆ سەیارە غرامە هەیە بەڵام بۆ ماتۆر نییە؟ ئایە بۆ ئاسنەکەیە کە سەیارە و ماتۆڕەکەیە یان پەیوەندی بەو ئینسانە هەیە کە لەناو سەیارە و سەر ماتۆڕەکەن؟
پاشان ئەوەئیهانە نییە بە یاساکانی هاتوچۆوە بەو پۆلیسەی وەستاوە لە واجبی خۆی، کود دەڵێ: ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە، ئەگەر ١٩٦٩ بە ئەلفی ئەو ئەجنەبیەمان بکردبا ئێستا ماتۆر و هاوڵاتی بەو شێوەیە هاتوو چۆیان دەکرد کە یاسا بۆی دیاری کردووین.

# کێشە کۆمەڵایەتییەکان

شادی ابراهیم

ئێمە لە سەردەمێکداین کە سەدەی خێرایی و تەکنەلۆژیایە و جیهان بە گشتی پێشکەتووە لەم بوارانەدا، بەڵام ئەوەی ئێستا کێشەی سەرەکی گومەڵگەکانە کێشە کۆمەڵایەتییەکانە، کێشەی کۆمەڵایەتی ئەو کێشانەن کە خەڵکانی نێوان یەک کۆمەڵگە کە لەسەر یەک خاک دەژین و یەک مێژوویان هەیە کێشە لە نێوانیان دروست دەبێ، هەندێجار هەستیشی پێ ناکەن، کۆمەڵگەی خۆمان زۆر جۆر لەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی تووش بووە کە ئەمەش جێی نیگەرانییە کە ناتوانین چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەو کێشانە دابنێین.
لە کێشە هەرە باوەکانی نێو کۆمەڵگەی کورد
* کەمبوونی خزمایەتی، خزمایەتی لەم سەردەمەدا بەرەو نەمان دەچێ ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە پارە و سەروەت و سامان رووی لە زیادبوون کردیە و خەڵکان زیاتر بیر لە کارەکانیان دەکەنەوە، لە سەردەمانی زوو دراوسێ سەردانی دراوسێکەی دەکرد و لە خەم و خۆشی و ناخۆشیا هەمیشە لەگەڵ یەکبوون، بەیەکەوە هەوڵیان دەدا بۆ باشکردنی بژێوی ژیانیان، بەڵام زۆرێک خەڵکی ئێستا تەنها ئەوەیان دەوێ کە خۆیان سەرکەوتوو بن و هەر خۆیان سەروەتی زیاتریان هەبێ، دراوسێی وا هەیە هیچیان لە حاڵی یەکیان نەپرسیووە و نازانن کە دراوسێ یاخود خزمەکەیان لەچ بارێکدایە.
بەڕاستی ئەوە کێشەیەکی هەرە گەورەیە کە کەس سەردانی خزم و کەسی ناکات، یان هەندێ کەس تەلەفۆنیش بۆ خزم و کەسەکانیان ناکەن تا وای لێدێت کە خزمایەتییان بەتەواوی دەپچڕێ و منداڵەکانیشیان بە خزمایەتی خۆیان نازانن و هەر لەسەر ئەمە بەردەوام دەبن.
* یەکێکی تر لە کێشەکان ئەوەیە کە خەڵکی زۆر روویان تەنیا لە دنیا کردووە، لەسەر ماڵی دنیا و سەروەت و سامان برا برا دەکوژێ یاخود باوک کوڕەکەی دەکوژێ، یان دوو هاوڕێ یەکتری دەکوژن تەنها لەسەر قسەیەکی بێ مانا یان ماڵی دنیا. پێشینان وتویانە کە( ماڵی دنیا چڵکی دەستە) بەڵام ئێستا ماڵی دنیا بووەبە هەموو شتێک بەو ڕادەیەی کە خەڵکانێک بەکوژ دەدرێن، بەراستی ئێمە گەڕاوینەتەوە بۆ سەردەمەکانی پێش هاتنی ئیسلام، خودای بەخشندە ئەقڵی بە هەموو مرۆکان داوە تا بیر بکاتەوەو لە کاتی پێویست بەکاری بێنێت نەوەک بیر و مێشکی بە شتی پڕوپووچ سەرقاڵ بکات.
* شوکردن یان ژنهێنان بەتەمەنی منداڵی هەندێ لە دایک و باوکان هەن کە منداڵەکانیان دەگەنە تەمەنی ١٥ ساڵی دەڵێن گەورە بووە کاتی ئەوەی هاتووە بچێتە رێو شوێنی خۆی، کە خێزانێکیان بۆ دروست دەکەن بەڵام نازانن کە خێزان چۆن بەڕێوەببەن و ئەقڵیان تەواو پێنەگەیشتووە ئەمە دەبێتە هۆی دروست بوونی چەندەها کێشەی گەورە لەنێوانیان و تەنانەت هەندێ جار دەگاتە ڕادەی جیابوونەوەش.
* ئینتەرنێت و موبایل یەکێکن لە ئامرازەکانی پێشکەوتنی ژیان، بەڵام کاریگەری زۆر خراپی لێ دەبێتەوە ئەگەر بە شێوەیەکی وا بە کاری بێنین کە ئالوودەبین پێی یاخود بەلایەنی خراپە بەکاری بێنین، فەیسبوک و چات وایان کردووە کە مێشکی هەزارەها کەس سەرقاڵ بکەن، زۆر بەکارهێنانیان وا دەکات کە کاریگەری لە تەندروستیت بکات یان کەم خەوی و ئارەزوو نەکردنی خۆراک کە زیان بە تەندروستیت دەگەیەنێت، هەندێ جار کەسانێک هەن زۆر بە خراپە بەکاری دێنن وای لێ دێت کە تووشی کێشەیەکی خانەوادەیی بێت و کێشەی زۆر گەورە بۆ خۆت و خانەوادەکەت بنێیتەوە، ئەمەش کە گەنجەکان زیاتر تووشی دەبن.
لە کۆتایی دەڵێم زۆرجار خۆمان دەبینە مایەی کێشە بۆ خۆمان و دەوروبەرمان بەڵام چارەکردنی چەندین زاناو دانای پێویستە کە بێنە هانامان.

# ڕاستە جگەرە بەدیلی خەمەکانە؟

زیاد بالیسانی

جگەرەکێشان یەکێکە لە باوترین دیاردەکان و لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا بەشێوەیەکی فراوان بەربڵاوە، هەمووومان هەتا ڕادەیەکی باش لە کارگەرییە خراپەکانی جگەرە لە سەر جەستەی مرۆڤ تێگەیشتووین و دەزانین داهاتووی جگەرەکێشان لە ڕووی تەندروستییەوە باش نییە و تەمەنمان بەرەو هەڵدێر دەبات، لەگەڵ هەموو ئەمانەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بازرگانییەکی زۆری پێوە دەکرێت و جگەرەکێشانیش ڕوو لە زیاد بوونە! زۆر جار لە جگەرەکێشم پرسیوە، ئەو دووکەڵ هەڵمژینە لە پێناو چی؟ لە وەڵامدا دەڵێن: جگەرەکێشان خەم ڕەوێنە و کێشەمان لە بیر دەباتەوە! مەترسییەکە لێرەوە دەست پێ دەکات، کەسی جگەرەکێش وا باوەڕی بە خۆی هێناوە کە باشترین چارەسەر ئەوەیە کە لە کێشەکانی بێ ئاگا بێ، ئەویش بە خۆ سەرقاڵکردن بە جگەرەکێشان، بەڵام با ئەوەش بزانین بەو فێر لەخۆکردنە چارەسەری کێشەکان دوادەکەوێت و کێشەکان قوڵتر دەبن، تووێژینەوە زانستیەکان دەریانخستووە کە دوکەڵی جگەرە تەرکیزی مرۆڤ کەم دەکاتەوە، پسپۆڕانی دەروونناسیش دەڵێن: لە کاتی بوونی کێشە و خەمۆکی و دڵ توندی پێویستیت بە ژینگەیەکی پاک هەیە تێیدا چەند جارەک بە قوڵی هەناسە بدەی و هەوایەکی پاک هەڵمژی بۆ ئەوەی باشتر تەرکیز بکەی، ئەوکات زۆر بەئاسانی دەتوانی چارە لە دەوروبەری کێشەکانت ببینیەوە و چارەسەریان بکەی، نەوەک خۆت لە ناو دوکەڵ بزر بکەی! جگەرەکێش جگە لەوەی کاریگەری خراپی هەیە بۆ خۆی، دەوروبەریشی لێی بێبەش نین لەو مەترسییە وەک دەڵێن: ئەوەی لای جگەرەکێش دابنیشێ ئەگەر زیانەکەی لە جگەرەکێش زیاتر نەبێ کەمتر نییە! هەر بۆیە کەسی جگەرەکێش لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە کەسایەتییەکی نەخوازراوی هەیە لای ئەو کەسانەی جگەرە ناکێشن، بە تایبەت لای هاوسەرەکانیان. بەهۆی پیس کردنی ئەو ژینگە پاکەی ناوماڵ بەو دوکەڵە مەترسیدارە و بۆنە ناخۆشەی بەردەوام لەگەڵیانە، خێزانەکانیان ناتوانن لایان دابنیشن ئەمەش کاریگەری نیگەتیڤ دەکاتە سەر خێزان و پەیوەندی هاوسەرێتی، کە سۆز و خۆشەویستی لە نێوانیان کەم دەبێتەوە! زۆر کات ئەو خوە خراپە منداڵەکانیش دەگرێتەوە بە تایبەت کوڕان، چونکە ئەوان زیاتر لاسایی باوکیان دەکەنەوە، سەیریش ئەوەیە کە هەمووکات باوکە جگەرەکێشەکان ڕێگرن لەوەی منداڵەکانیان جگەرە بکێشن بەمەش منداڵەکە سەری لێ سوڕ دەمێنێ لەوەی بۆچی بە خۆی جگەرە دەکێشێت و لەو ناگەڕێت! نازانێ باوکەکە لە بەرژەوەندی ئەو قسە دەکات یان لە دژی، هەر بۆیە متمانە لای کەم دەبێتەوە، ئەو حاڵەتەش کاریگەری نەرێنی دەبێت لە سەر منداڵەکان و لەڕووی دەروونییەوە ئەو خێزانە هاوسەنگ نا بێت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پرسیار بکەم، جگەرەکێشی بەڕێز هەست دەکەی بە هۆی جگەرەکێشانەکەتەوە بە دەیان ئارامیت لە خۆت شێواندوە؟ جگە لە تەندروستیت، هەستت بەوە کردووە خێزان و دەوروبەرەکەت لێت بێزارن! خێزان ئەو بازنە ئارامگەیەیە کە هەریەک لە ئێمە بۆ حەسانەوەی خۆی بە هەموو شێوەیەک گرنگی پێ دەدات، ئایە تۆش تەندروستی خێزانەکەت بەلاوە گرنگە؟ زۆر ترسناکە مرۆڤ لە بەر حەزێکی خۆی چەندەها شتی باش پشت گوێ بخات! دەمەوێت بپرسم جگەرەکێشان بووە بەدیل بۆ کێشەکان یان خودی خۆی کۆمەڵێک کێشە و نەهامەتیت بۆ دێنێ؟ بۆیە دڵنیابە تەنها بە لادانی جگەرەکێشان لە ژیانت ڕاستەوخۆ کۆمەڵێک خۆشگوزەرانی ڕووت تێدەکات.





دە پیاو بە سوعبەت شەرە تەقەیان دەکرد، (٣) کوژران و (٤) بریندار بوون سێ یەکەی دی کوتیان بەسە سوعبەت با نەبتە ڕاستی.

# پەروەردەی ئەمڕۆ مەترسییە بۆ داهاتووی وڵات



ئازا ئەحمەد

کاتێک پرسیار لە نزمبوونەوەی ئاستی زانستی و نەبوونی داهێنانی قوتابی دەکرێت لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندن، لە وەڵامدا زۆربەی تاوانەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ خودی قوتابی، بەڵام پێچەوانەکەی راستە، قوتابی وەکو ماددەیەکی خام وایە بە دەستی دام و دەزگا پەروەردەییەکان، هیچ کاتێک قوتابی بەربەست نەبووە و نابێت بۆ بەرەو پێشبردنی زانست و داهێنان، بەڵام ئەوەی جێگای داخە نەبوونی پلانێکی پێشکەوتووە لەلایەن دام و دەزگا پەروەردەییەکان کە لەو رێچکەیە کاردەکەن، بۆیە پێویستە ئاوڕێک بدەینەوە لە رێ و رێچکەی خوێندن، گەر بمانەوێت وڵات و نیشتمان بەرەو پێش و خۆش گوزەرانی بچێت یەکەم قۆناغ گۆڕینی نیزامی خوێندنە، چونکە باشترین رێگەیە بۆ دەرخستنی توانا و بەها رەوشتیەکان لای مرۆڤ، ئامانج لە خوێندن تەنها ئەوە نییە قوتابی لە کاتی تەواوکردنی خوێندن پۆستێکی وەزیفی وەربگرێت و ژیانی ئابووری تەرخان بکات، ئامانجی خوێندن زۆر لەوە بەهادار ترو گەورەترە، تاکەی ترسمان لەوە بێت کە ناتوانین گۆرانکاری بکەین لە نەوەکانمان، بۆچی نەتوانین ئەزموونی وڵاتە پێشکەوتووەکان پاش گونجاندنی لە گەڵ کۆمەڵگەی خۆمان جێبەجێ بکەین، لەوەش پێویستتر بۆ نەتوانین داهێنان بکەین و لە وڵاتان پێش کەوتوتربین؟

گەر بێت و چاو خشانێک بکەین بە ناو دام و دەزگا پەروەردەییەکانمان، ئەو وەختە بۆمان روون دەبێتەوە تاکە چینی بێتاوان لەم رێچکەیە قوتابییە، بە داخەوە کەیەکەم قوربانییە، بۆ نمونە لە قوتابخانەکان شەش وانەی چل خولەکی دەکرێت لە رۆژێکدا، لە نێوان هەر دوو وانە پێنج خولەک بۆ پشوو هەیە قوتابی بەوە راناگات لە پۆل بێتە دەرو لە کاتی زەنگی چوونە ژورەوە بچێتە ژوورە، لە بەر نەبوونی بەرنامەیەکی پەروەردەیی بۆ تۆکمەکردنی کەسێتی قوتابی زۆربەی بەرێوەبەرەکان ئەوەی زۆر پێی دڵ گران بن ئەو پێنج خولەکەیە، چونکە ئەو قوتابییەی کە چل خولەک لە ناوچوار دیواردا بوو ئێستا کە بەردراوە ئەو پێنج خولەکە نازانێت چی بکات بۆیە زۆر جار ئاژاوە دەنێتەوە، داخۆ ناو پۆل لای قوتابی چۆن بێت، هەستی چی بێت بەرامبەر بەو کاتەی کە لە پۆل دەیباتە سەر، راست گۆیانە بڵێین پۆل وەکو زیندانێک وایە، چونکە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئاوات و ئارەزوو توانا شاراوەکانی قوتابی یەکناگرێتەوە، زۆربەی پۆلەکان لە زستاندا سارد و لە هاویندا گەرمن، زۆری ژمارەی قوتابی کە لەوانەیە لە هەندێک قوتابخانە بگاتە (٦٠) قوتابی لە پۆلێکدا، بەمەش زۆر جار هۆکارەکانی هەواگۆڕکێ لە پۆلەکاندا نایەکسان دەبێت لە گەڵ رێژەی قوتابی، بێگومان کەمی ئۆکسجین لە هەر شوێنێکدا دەبێتە هۆی کەم ئۆکساندنی خۆراک و دواتر کەم بوونی رێژەی ووزەی پێویست بۆ بیرکردنەوەی قوتابی.

هەر مامۆستایەکیش کە دێتە پۆل کۆمەڵێک وانە دەدات بە قوتابی و کۆمەڵە ئەرکێکی پێ دەدات، قوتابیش دەبێ بێ دەنگ بێت و گوێ لە مامۆستا بگرێت، پاشان قوتابییەکە ئەوەی لە ماڵ لەبەری کردووە وەکو توتی دووبارەی بکاتەوە، ئەو قوتابییەشی توانای لەبەرکردنی زۆر بێت ئەوا بە زیرەک ناودەبرێت، بەداخەوە زۆرجار رێزنەگرتنی قوتابی و جوێن پێدانی لە لایەن مامۆستا، ئەمەش هۆکارەکەی خودی مامۆستا نییە بەڵکو بار و دۆخێک دروست بووە مامۆستا ناچار دەکات، بوونی تەنها یەک وانەی تەرفیهی کە وەرزشە ئەویش زۆرجاران دەکەوێتە وانەی شەشەم و قوتابیان بۆ ماڵەوە رەوانە دەکرێنەوە، لە بەرنەبوونی گۆڕەپان لە زۆر قوتابخانەکان ئەم وانە وەرزشە کە تاکە هەناسەیەکە بۆ قوتابی ئەنجام نادرێت.

نەبوونی وانەیەک بۆ برەو پێدانی نەریت و بەها رەوشتیەکان و خۆشەویست کردنی نیشتمان لای قوتابی، چارەسەر نەکردنی کێشە سێکسیەکانی قوتابی ئەویش بەهۆی نەبوونی وانەیەک بۆ ئەم مەسەلەیە، کە زۆر لە گەنجان پانتاییەکی زۆری مێشکیان ئەم بابەتە داگیری کردووە، کەمی کاتی دەوامی قوتابخانەکان کە لە چوار سەعات و نیو تێپەڕ ناکات کە ئەمەش کەمە بۆ فێرکردنی قوتابی، نەبوونی هۆیەکانی فێرکردن و نەبوونی تەکنەلۆجیای نوێ وەکو تاقیگەی کۆمپیوتەری و تاقیگەی بەشە زانستیەکانی تر، بەداخەوە نەشارەزایی هەندێ لە مامۆستا

دوو کافر نانیان دەخوارد یەکەمیان کە دەستی کرد بە نان خواردن وتی بسم الله ئەوی تریان پێی وت: بێ عەقل ئێمە کافرین خێرا بڵێ استغفرالله.

بەڕێزەکان نەزانینیان بە چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لە گەڵ قوتابی، ئەمەشیان بەهۆی نەبوونی خولەکانی ڕاهێنان و برەو پێدانی تواناکانی مامۆستا سەر هەڵدەدات، سەرەڕای ئەمەش پیس و پۆخڵی زۆربەی قوتابخانەکان، بە داخەوە ئەوەی ڕەچاو نەکرابێت لایەنی خۆشگوزەرانی دەروونی قوتابییە، چەندی باس لە کەم و کوڕییەکان بکرێت تەواو نابن، لێرەدا دەستی تاوانباری ڕاناکێشم بۆ دام و دەزگاکانی پەروەردە چونکە هەوڵێکی زۆر دراوە بەڵام بەداخەوە ئامانجی نەپێکاوە، چونکە ئەم پرۆسەیە خەمی هەموومانە وەک باوک و دایک و مامۆستا و قوتابی، بەڵکو ئەوەی پێویستە تەنها بوونی پلانێکی ڕێکوپێکەکە بە سوودمەندی هەموو لایەک تەواو دەبێت.

دەکرێت لێرەدا چەندین چارەسەر دابنێین بۆ ئەم مەبەستە: ١- درێژکردنەوەی دەوامی قوتابی کەمتر نەبێت لە هەشت کاتژمێر، بەمەش قوتابی تاڕادەیەک پێویستی بەوە نابێت کە لەماڵەوە بخوێنێت، بەڵکو هەموو خوێندنەکەی دەکەوێتە قوتابخانە لەگەڵ هاو پۆلەکانی و مامۆستا بە مەرجێ لایەنی خواردن و پاکو خاوێنی بۆ دابینێ بکرێ.

٢- لەم ماوەیەدا بوونی جۆرەها کاتی جیا بۆ پشوو دان و خواردن و یاری کردن و سەیرکردنی بەرنامەی بەسوود و تەرفیهیەکان، وەک ئەوە وابێ مامۆستا و قوتابیەکان وەک خێزانێک بن.

٣- گۆڕانکاری لە پرۆگرام بە شێوەیەک بگونجێت لە گەڵ ئەو بارەو هەڵقوڵاوی داب و نەریت و ڕەسەنایەتی بێت و بگونجێت لە گەڵ ئاینی نەتەوایەتی، مەنهەجەکەش دوو بەش بێت، بەشێکیان هەموو قوتابیان لێی هاوبەش بن، بەڵام بەشەکەی تریان خۆی قوتابی خۆی لە چ ئاستێک دەبینێت لەوێوە مومارەسات بکات.

٤- دابینکردنی تەکنەلۆجیای سەردەم وەکو تاقیگەی کۆمپیوتەری و تاقیگە زانستیەکان و هۆڵ و پێداویستیەکانی فێربوونی پیشە جۆراو جۆرەکان.

٥- ڕاهێنانی مامۆستایان بۆ ئەوەی بتوانن بگونجێن لەگەڵ دەروونی قوتابی لە ئاستە جیاییەکان.

٦- بوونی ئازادی کەسی لە ناو پۆل، وەک دانیشتن و هەڵس و کەوتی قوتابی.

٧- بەرزکردنەوەی ئاستی دایک و باوکی قوتابی و بەو ڕادەیەی کە هاریکار بێت لە گەڵ مامۆستایان و دەستەی بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکان.

٨- ناو بەناو گەشتی زانستی و تەرفیهی کردن بۆ قوتابی.

٩- بوونی باخچە و چێشتخانە و پەرستگا لە قوتابخانەکان.

١٠ - بوونی هۆڵیکی مۆسیقا و بەها هونەریەکان.

١١- بوونی بەشی وەرزشی کە قوتابیان بتوانن ئارەزووی هەرجۆرە وەرزشێک بکەن لەوێ مومارەسەی بکەن، ئەمەش سوودمەند دەبێت بۆ توانا ئەقڵی و جەستەیی قوتابی و خۆشگوزەرانی دەروونی.

١٢- بەرزکردنەوەی باری ئابووری کارمەندانی پەروەردە بە جۆرێک هیچ کارمەندێک پێویست بەوە نەکات بیر لەکارێکی تر بکاتەوە بۆ بژێوی ژیان، بەمەش خۆشگوزەرانی کارمەندانی پەروەردە بە هەموو جۆرە وەزیفیەک دەبێتە پێشەنگ بۆ چاولێکردنی قوتابی لە مامۆستا و کارمەندانی پەروەردە کە چۆن سوودمەندبوونە لە خوێندن.

لەوانەیە گەر یەکێک ئەم بۆچونانەی گوێ لێبێت بڵێت لەوانەیە کاکی نووسەر لە هەسارەیەکی ترەوە هاتبێت و ئاگای لەوە نەبێت کە خەڵکی ئەو هەرێمە تائێستا جێگیربوونێکی سیاسی و خاوەن دەرامەتی خۆی نییە، چۆن ئەمە بکرێت لە کاتێکدا ئەمە پێویستی بە سەرمایەیەکی زۆر هەیە، بەڵام لێرەدا بۆ هەموو تەنگەژەیەک چارەیەک هەیە، بۆ نمونە ئەم خاڵانەی کە باس کران هەمووی بە پێشکەوتنی ئابووری وڵات کۆتایی دێت، بە مەرجێک بتوانرێت سوود لە تواناکانی قوتابی وەربگیرێت، ئەویش بە بوونی کاتێکی دیاری کراو لە پشووەکان یان لە ڕۆژ بۆ کارکردن، قوتابی لەو کارگە و شوێنی شیاوانە کاربکات کە لە گەڵ ئارەزووەکان و تەمەنی بگونجێت، بەمەرجێک ئەو کارەی قوتابی دەیکات پەیوەندی هەبێت بەو خوێندنەی کردویەتی، واتا بە پراکتیک کردنی ئەو نەزەرییاتانەی کە قوتابی خوێندویەتی، واتا ئەو بڕە پارەیەی کە کەسوکاری قوتابی بۆ قوتابی ناتوانێت دابینی بکات قوتابی دەتوانێت خۆی بۆ خۆی دابینی بکات، بەمەش وڵات لە ڕووی پیشەسازیەوە بەرەو پێش دەچێت، جگە لەمەش قوتابیەکەش بە پێی حەز و ئارەزووەکانی کاردەکات و برەو بە تواناکانی دەدات، ئەو خێزانەی کە دەتوانێت خەرجی قوتابیەکەی بدات ئەوکات قوتابی دەتوانێت کار نەکات، بەو بڕە پارەیەی کە خودی قوتابی یان خانەوادەکەی دەیدەن دەکرێت بژێوی ژیانی کارمەندانی پەروەردە لەو پەڕی دابێت و لە ڕووی ئابوریەوە حکومەتیش زۆر سوودمەند بێت، لەوانەیە پرسیار بکرێت داخۆ قوتابیەکی یەکی سەرەتای چۆن بتوانێت خەرجی خۆی بدات، ئەمەش دەکرێت حکومەت وەکو قەرزێک ئەم بڕە پارە کەمە بدات، تا ئەو کاتەی ئەو قوتابیە توانای خۆ ژیانی دەبێت.

# پشیلەکان برسین

ژیان صالح

لەوکاتەی حاویەی زبڵ دانراوە، پشیلەکان لاوازو کەمبوونەتەوە و لە برسان دەناڵێنن لەدەست برسیتی خۆیان و بێچووەکانیان، بەس ئاخۆ کێ گوێبیستی ناڵەی ئەوان دەبێت و بەتەنگ برسیتیان دەچێت؟ خۆ ئەگەر گوێشمان لە ناڵەیان نەبێت بەس دەیان بینین چەندە لاوازو بووینە. ئایا پیویستمان بە پێداچوونەوەیەک نییە بۆ بیرکردنەوەکانمان لەزۆربەی بوارەکانی ژیانمان؟ تاکەی بیرکردنەوەکانمان لەچوارچیوەی بازنەیەک بخولێتەوە گەشەی پێنەدەین و بازنەکە گەورە نەکەین بۆچی وولاتانی ڕۆژئاوا کە موسلمانیش نین، بەڵام ئازاری گیاندارو باڵندە نادەن بەڵکو زۆربەی ئەو گیاندارانەی کە کێوی نینە خۆراکی تایبەتی خۆیان هەیە لە سوپەرمارکیتەکان دەفرۆشرێت، دەی خۆ ئیمە ئینسانین ئەگەر ئاواشیان بۆ نەکەین دەکریت ئەو مافەی کە پێشتر هەیان بووە بۆیان بگەڕێنینەوە کە پاشماوەی خۆراکە گۆشتیەکانی ئیمەیە، لەجیاتی ئەوەی بیان خەینە ناوحاویەی زبل کەتێک دەچێت و بۆگەنی دەبیت پاشان دەبردریتە دەرەوەی شار و فرێدەدرێت و ئاووهەوای ژینگە پیس دەکات زەرەر بە تەندروستی ئیمەش دەگەیەنێت، دەکرێت لە سوچێکی سەربانەکانمان یان سوچێکی حەوش و باخچەکانمان دابنرێت تاکو بیخوات، خۆت ئەو کات زۆر دلخۆش دەبیت کەمافی ئەو گیاندارەت داوە، جارێک بە برادەرێکم وت کە ئەو پاشماوە خۆراکانە فرێنەدرێت و بۆیان لە سوچێکی ماڵەکە دابنرێت وتی لێیان بگەرێ خودا رزقیان دەدات! بەڵی منیش دەڵێم خودا رزقیان دەدات بەس ئایا ئیمە بەشێکی ئەو رزقەی ئەوانمان دەست بەسەر دانەگرتووە؟



# بە ئاسانی سەرکەوتن بە دەست بێنە



شوان عوسمان

یەکێک لەو گرفتانەی رووبەڕوی مرۆڤ دەبێتەوە تێکەڵبوونی ئامانجەکانیەتی لەگەڵ ئامانجی کەسانی تر بە جۆرێک ئەم حاڵەتە سەر دەکێشێت تا دەگاتە ونبوونی ئامانجەکانی، دواتر نەک هەر ئەوەندە بەڵکو خودی خۆشی لێ ون دەبێت، بۆیە زۆربەمان ئەگەر هەمووشمان نەبین هەڵوێستی ئەورۆمان لەگەڵ بەیانی جیاوازی زۆری هەیە، ئەمەش دەبێتە مایەی بێزاریمان و دەکەوینە حاڵەتێکی دەروونی ناجێگیر، تەنانەت دوای ئەنجامدانی کارەکانیشمان ئاسودەبوونمان بەرێژەیەکی زۆر کەمە، ئەمەش بێگومان جێی سەرنجە! چونکە مرۆڤ دوای ئەنجامدانی هەر کارێک ئەگەر بچووکیش بێت هەست بە خۆشییەکی زۆر دەکات، لە زانستی NLP ئەم هەستە پێی دەگوترێت (چێژی بەدەست هێنان). هەر بۆیە ئامانجەکانیشمان شێواون و بڕیارەکانیشمان بە هەمان شێوەن.

لێرەدا گرنگە دوای ئەنجامدانی هەر کارێک پێوانەی ئەو هەستە بکەین کە تا رادەیەکی باش هاوکاریمان دەکات بۆ بەردەوام بوون یا وەستان لە کارەکە.

هۆکاری ئەم گرفتە بەڕای من بێ بەرنامەیی و بێ ویستی خۆمانە وامان لێ دەکات لە چوارچێوەی پلان و ویستی خەڵکانی تر بژین یان ببین بە بەشێک تێیدا. لێرەدا مەرج نییە خۆت خاوەن پرۆژە بیت، بەڵکو ئامانجەکانت دیاری بکەیت بەر لە ئەنجامدانی کارەکانت ئەو کات لە چوارچێوەی خۆت دەژیت کارەکەی ئەوانیش ئەنجام دەدەیت.

بۆ چارەسەری ئەم گرفتە سەرەتا پێویستە ئامانج و ویستەکانت لەبەر چاو بێت، دواتر ئەو کارانەی کە نیازی بەیانی و رۆژانی داهاتو ئەنجامی بدەیت ئەویشت لەبەر چاو بێت، ئینجا دەکرێ پرسیار بکەیت ئەوەی من دەیکەم چەندی هی خۆمە و چەند هی خەڵکانی ترە؟ چەندە من بەرەو پێش دەبات و چەند خەڵک چاوەڕێمە ئەنجامی بدەم؟ بۆ خۆمی دەکەم یان بۆ خەڵکی؟ هەنگاوێکی سادە و ساکارە بەڵام دڵنیام ئەنجامی زۆر گەورە بەدەست دێنیت کە گرنگترینیان بۆت روون دەبێتەوە تا چەند ئاڕاستە کراوی؟ بیری خۆت لە دەست داوە و بە بیری خەڵک بیرت کردۆتەوە، جگە لەوەی خەڵکی دەورو بەرت چەند لە پێشەوەی تۆن! کە دەبوایە تۆ زۆر لە پێش ئەوان بوای! ئەوانە و ئی تریش.

# نمونەی قوتابخانەیەکی سەرکەوتوو لە یابان

قوتابخانەیەک لە یابان سەرنجی دنیای بۆ لای خۆی راکێشاوە، بۆیە هەوڵ دەدەین وردەکارییەکانیان بخەینە روو

لەم قوتابخانەیە قوتابی زۆرترین زانست فێردەبێت، ئەم قوتابخانەیەش ٣٦٠٠٠ قوتابی لە خۆ دەگرێت لە پۆلە سەرەتاییەکان، لە نزیکی ٨٤ جێگەی جیاواز، بۆ نمونە نزیکەی ٨٢ قوتابی بە یەکەوە فێری پیتەکان دەکرێن کە ٢٠٠ پیتە، لە کاتێکدا کە هەر پیتێک وشەیەک یان مانایەک یان دەنگێک دەنوێنێت، بۆ نمونە مامۆستا داوا لە قوتابیەکانی پێشەوە دەکات کە بابەتەکە بخوێننەوە بە تەرکیزێکی زۆر و پاشان وەڵام دانەوەی پرسیارەکانی مامۆستا، لە لایەکی تری پۆلەکە قوتابیەکانی تر ناوەستن لە گوتنی نوکتە و گەمە و گاڵتە کردن، ئەمەش وادەکات کە کەشێکی خۆش دروست ببێت لە پۆل و قوتابیەکانی بەهۆیەوە پێشبرکێ بکەن لە دەست بڵند کردن و وەڵام دانەوەی پرسیارەکان، پاش بە سەربردنی ١٢ کاتژمێر خوێندن لە قوتابخانە ئینجا قوتابیەکان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان، دایک باوکان هەموو هەوڵ و تەقەلایەک دەدەن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بنێرنە ئەم جۆرە قوتابخانەیە، سەرکەوتوویی ئەم قوتابخانانە وای کردووە کە

# زۆربەی گرفتەکان هۆکاری لێکنەگەیشتنە

هێمن جەمیل




یەکێک لەو گرفتانەی کە لە نێو کۆمەڵگە بوونی هەیەو بگرە زۆرجاریش بەهۆیەوە کێشەکانی تێدا قوڵتر دەبێتەوە ئەویش لێک نەگەیشتنە کە لە ماوەی گفتوگۆو چارەسەری کێشەکاندا روودەدات.

ئەگەر تیشکێک بخەینە سەر هەندێک لە هۆکارەکانی لێک نەگەیشتن و بە چەند خاڵێک بیانخەینە روو ئەوا:

* یەکترناسین: دەتوانین بڵێین یەکتر ناسین هۆکارێکی هەرە گرنگە بۆ لێک گەیشتن، چونکە دەبێتە هۆی زیاتر شارەزابوونی لەبۆ کەسی بەرامبەر لە خواست و ویستی کاتی روونکردنەوەی.

* نەویستن: ئەمەش هۆکارێکی ترە، کە دەبینین زۆرجار وەک بڵێی نەیەوێ لە روونکردنەوەی کەسی بەرامبەر تێبگا، دیارە دروستبوونی ئەم حالەش پاڵنەری هەیە وەکو (پێشبینی نەکردنی ئەو جۆرە ئاکارو رەفتارە لەکەسی بەرامبەردا، کەوای لێدەکا نەیەوێ گوێی بۆ بگرێ، یا بەپێچەوانەوە پشت بەستن بە هەندێ رووداو یا دیاردە لەم شێوەیە کە لەم کەسە روویدابێ لە رابردوو، دیسان وای لێدەکا هەوڵی گوێگرتن نەدا بۆی).

* بوونی وشەی نەویستراو یا قبول نەکراو لەکاتی گفتوگۆدا: ئەم دیاردەیە زۆر باوە کە لە کاتی بوونی گرفتەکاندا روودەدەن و باری لێک گەیشتن و نزیک بوونەوە لەگفتوگۆکاندا دوورتر دەخەنەوە، کە هەرچەندە لەزۆر کاتیشدا کەسی بەرامبەر ویستی راستەقینەی ئەو وشەیە یا ئەو وتەیەی نەبووە لەو دەریبڕینە.

* لادان لە گفتوگۆی ویستراو: مەبەست لێرەدا ئەوەیە لەسەر رێچکەی راستەقینەی گفتوگۆ یا کێشەکە لایان داوەو بە بابەتێکی لاوەکی خۆیان سەرقاڵ کردووەو وتووویژ دەکەن، بێگومان لێک گەیشتنەکان دوور دەخەنەوە.

*شێوازی دەربڕین: وەکو دەڵێن مار بەقسەی خۆش لە لانەی خۆی دێتە دەر، دەتوانین بڵێین سەری نەگەیشتن بە کێشەکان ئەوەیە، چونکە دەربڕین هەستی بەرامبەر دەجوولێنێ و وای لێدەکا هەوڵبداو بتوانێ لە مەبەستی کەسی بەرامبەر تێبگا، بۆیە شێوازی دەربڕین توندو تیژی و هەڵچوون پێوە دیار بێت و لە هەمان کاتیشدا کەسی بەرامبەر ئارامگر نەبێ ئەوا لێک نەگەیشتن سەر هەڵدەداتەوە.

بۆیە گوێگرتن و پەلەنەکردن و سەرنجدان گشتیان هۆکارن کە بواری وتوویژ و گەیشتن بە چارەسەری کێشەکان ئاسان و روونتر دەکەنەوە.

دایک و باوکەکان منداڵەکانیان بنێرن بۆ ئەوێ چونکە سەرکەوتنێکی باش و زانستێکی زۆر فێر دەبێت کە لە قوتابخانە رەسمیەکان قوتابی ئەم برە زۆرە لە زانست فێر نابێت، هەر لەم قوتابخانەیە قوتابی پاش تەواوبوونی وانەکان دەست دەکەن بە خاوێن کردنەوەی پۆلەکان بە مەرجێک مامۆستاش لەگەڵیان بەشدارە، هۆکاری ئەوەی کە دایک و باوکەکان بە پەرۆشی ئەو قوتابخانەیەن چونکە قوتابی زانستێکی زۆر و پیشەیەکی زۆر فێر دەبێت، بە جۆرێک لە هەموو کۆمپانیایەکان داواکاری هەیە لە سەر دەرچووانی ئەم قوتابخانەیە، لە قۆناغی سەرەتایی تەنها یەک مامۆستا وەکو باوکێکی بە خەم هەموو وانەکان دەدات بە قوتابی، لەم قۆناغەدا قوتابی فێری زمانی دایک و بیرکاری و زانستە کۆمەلایەتیەکان وکاری ماڵ و مۆسیقا و هونەری دەستی دەبێت، لە قۆناغی ناوەندی فێر دەکرێن چۆن کارا بن لە ناو کۆمەڵگە و خۆیان بە ئارەزووی خۆیان ئەو بەشە هەڵدەبژێرن کە دەیانەوێت، بەلام لەم قۆناغە هەر مامۆستایەک تایبەتە بە بابەتێک.

بۆیە لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە بۆچی و تاکەی خەمخۆری منالەکانمان نەبین و پلان دانەنێین بۆ سەدەها ساڵ و مانگ و رۆژی داهاتوو، تاکەی منالەکانمان بە ئاگری ئێمەوە بسوتێن، بۆچی ئێمە هۆکار نەبین بۆ پێشکەوتنی نەوەکانی دوای خۆمان، بۆچی تەنها بیر لەو کاتە بکەینەوە کە تێیدا دەژین، ئەو گەلانەی کە لە گەڵ پێشکەوتن هاوشانن هیچیان لە ئێمە زیاتر نییە، ئەوە نەبێت ئەوان تواناکان و پلانەکانی خۆیان بە گەڕخستووە، بۆیە کات چەند زووبێت ئەوەندە درەنگە بۆ دەستپێکردن.

ئەوەی قەرز بداتەوە دەوڵەمەند دەبێ (فەرەنسی)

# پەند وەک چارەسەر

سەباح مەجید

بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ دووچاری کێشە و گرفت و مەینەتی جۆراوجۆر هاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتووە، بەڵکو هەموو توانستی خۆی لەپێناو چارەکردنی کێشە و گرفتەکان خستۆتە گەڕ، زۆرجار لەم میانەدا سەرکەوتوو بووە و زۆرجاریش شکستی خواردووە، بەڵام هەر ئاسوودە بووە بەوەی کە خۆی بەدەستەوە نەداوە و هەوڵی خۆی داوە و ئەوەی لەسەری بووە کردوویەتی. ئیدی زۆرجاریش سەرگوزەشتەی سەرکەوتن و شکستەکان لە رستەیەکدا خەستکراونەتەوە کە ئێمە ئەمڕۆ پێی دەڵێین (پەند). کەواتە ئێمە لە هەناوی پەندەکانەوە دەکرێ ئاشنای هۆکار و ڕێگاکانی سەرکەوتن و شکستنخواردن ببین.. ئەمەش بە هەڵوەستەکردن و تێڕامان لە پەندەکانی ژیانی مرۆڤەکان، نەک هەر خوێندنەوەیەکی سەرپێیانەی ڕاگوزاری. لێرەدا زۆر بەکورتی و بەکوردی هەڵوەستە لەسەر چەند پەندێک دەکەین:

* کورد دەڵێ: (دەست پانکەیتەوە لەپێ دەکەویت)، لەم پەندەوە هۆکاری لەپێکەوتن و داڕووخانی مرۆڤ و هەرەسهێنان و شکستی مرۆڤ چەندە بەڕوونی دیارە! ئەی چی وادەکات کە ئێمە لەپێنەکەوین و دانەڕووخێین و شکست نەخۆین؟ هەر ئەم پەندە پێمان دەڵێ: (کار)، بێگومان کاریش جۆری زۆرە، بەڵام ئاشکرایە کە (هەر چاکە، چاکە)، کەواتە بەکاری چاکە لەسەر پێی خۆمان دەوەستین و ڕووبەڕووی شت دەبینەوە، ئەوانەی کە کار دەکەن پیاو چاکن، بەڵام باشترین پیاو چاک ئەوەیە کە زیاتر کار بۆ خێزانەکەی بکات و لەخزمەتیاندا بێت.

* دیسانەوە کورد دەڵێ: (کەم خۆری دایم خۆر بە)، بەڕاستی ئەم پەندە ڕەهەندێکی پزیشکی زۆر بەرزی هەیە، کە ئەمڕۆ پسپۆڕانی بواری تەندروستی بەردەوام ئامۆژگاری خەڵکی پێدەکەن کە کەم خواردن سوودێکی زۆری هەیە و بەپێچەوانەوەش زۆرخۆری زیانێکی زۆری بۆ تەندروستی مرۆڤ هەیە، ئیدی لەم پەندەوە دەکرێ سەرکەوتنی خۆمان لە پارێزگاری کردن لە تەندروستی خۆمان فێربین، ڕێگایەک لەو ڕێگایانەی کە دەمانباتەوە تەندروستییەکی باش، کەمخۆرییە، بێگومان مرۆڤیش تا تەندروستی باشتر بێت ئەوە لە ناز و نیعمەتێکی زۆرتر دایە و لە لایەنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئایینی و ..هتد کەمتر کێشە و گرفتی بۆ دروست دەبێت.

* هەر باسی کورد ناکەین، پەندێکی چینی هەیە دەڵێ: (ئەگەر ماسییت بە کوڕەکەتدا ئەوە یەک جار نانی پێدەدەیت، بەڵام فێری ماسیگرتنت کرد ئەوە بەدرێژایی ژیانی نانت پێداوە). لەم پەندەوە چ هۆکارێکی سەرکەوتن و چ هۆیەکی شکشتهێنان بەدی دەکرێت؟ بێگومان لەم پەندەوە لەوە حاڵی دەبین کە لەجیاتی ئەوەی لە خێزاندا باوک و دایک هەر خەریکی ئەوەبن کە بەخۆیان لەجیاتی کوڕ و کچەکانیان کاربکەن و بیربکەنەوە و خۆیان ببن بە خودی کوڕ و کچەکانیان ئەوە لە ئایندەدا و تا کۆتایی کوڕ و کچەکانیان دەبن بە بار بەسەر شانیانەوە و وایان لێدەکەن کە بۆ گەیشتن بە ئاوات و خەونەکانیان هەر پشت بە کەسانی دیکە ببەستن و خۆیان نە بیربکەنەوە و نە هەوڵ بدەن! ئەمەش لە ئایندەدا کێشە و گرفتی زۆر هەم بۆ دایک و باوکان و هەمیش بۆ کوڕ و کچەکان دروست دەکات، بەڵام هەر لەپەندەکەوە ئەوە فێردەبین کە ئەگەر دایک و باوکەکان هەر لە سەرەتاوە منداڵەکانیان فێری ئەوە بکەن کە خۆیان بیربکەنەوە و خۆیان کاربکەن ئەوە ئیدی هەر زوو پشت بەخۆیان دەبەستن و خۆشیان و دایک و باوکیشیان لەسایەی ئەم فێربوونە بەنرخە وچان دەدەن و ڕێگایەک بەرەو ماڵی خۆشوودی و بەختەوەری دەدۆزنەوە.

* پەندێکی یابانی هەیە کە دەڵێ: (ئەگەر کوێرێک دەستی کوێرێکی دیکەی گرت، بێگومان هەردووکیان پێکەوە دەکەونە چاڵەوە). ئەی لەم پەندەوە پەی بە کام ڕێگا و هۆکاری شکست خواردن دەبەین؟ لەم





**پەندێکی ئەڵمانی هەیە کە دەڵێ: (ئەوەی مۆمی کەسانی دیکە بکوژێنێتەوە، لە تاریکیدا دەمێنێتەوە)**

پەندەوە ئەوە فێردەبین کە مرۆڤ نابێت بەبێ ئاگاداری، دەستی کەسانی ناشارەزا و نابەڵەد بگرێت! چونکە سەرەنجام لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەستی گرتووە بەیەکەوە دووچاری چەندین کێشە و گرفت دەبن و دەکەونە ناو چاڵی شکستهێنان، بەڵام پێویستە شوێن کەسانی شیاو بکەوین کە بە بیروبۆچوونەکانیان ڕێگەکانمان بۆ ڕۆشن دەکەنەوە، ئەوکاتیش دەگەینە شانشینی سەرکەوتن. کەواتە هۆکار و ڕێگایەکی دیکەی سەرکەوتن ئەوەیە کە هاوڕێیەتی کەسانی باش و زیرەک و بیر ڕووناک بکەین، بەپێچەوانەوە ڕێگە و هۆکارێکی شکستهێنانیش فێر دەبین کە ئەویش هاوڕێیەتی کردنی کەسانی خراپ و تەمەڵ و تاریکبیرە.

* پەندێکی فەرەنسی هەیە کە دەڵێ: (ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە دەوڵەمەند دەبێت)، لەم پەندەوە ڕێگا و هۆکارێکی سەرکەوتن بەدی دەکەین کە بەڕاستی زۆر گرنگە بۆ بنبڕکردنی زۆرێک لە کێشە و گرفتەکان. ئەویش ئەوەیە کە هەرکاتێک قەرزمان کرد، ئەوە دەبێت قەرز بدەینەوە بە خاوەنەکەی، چونکە بەم کارە کێشە و گرفتی زۆر چارە دەکەین و ئەوانەشی کە چارەی کێشە و گرفتی مرۆڤەکان دەکەن، هەمیشە دەوڵەمەندن، چ بە پارە چ بە دڵ و دەروون، ئەمڕۆ لەناو کۆمەڵگەی کوردی بەدەیان کێشە بوونیان هەیە کە هۆکارەکەی نەدانەوەی قەرزە، بێگومان هەڵوەستەکردن لەسەر پەندێکی وەهادا ڕەنگە زۆرێک لە کێشەکان چارە بکات. کەواتە ڕێگا و هۆکارێکی دیکەی سەرکەوتن ئەوەیە کە ماف و ئەمانەتی خەڵک بۆ خەڵکان بگێڕینەوە و ئەو شتانەی کە هی خۆی نییە، بەزۆر نەیکات بە هی خۆی.

* پەندێکی یوگسلاڤیا(ئەم وڵاتە ئێستا لە نەخشە نەماوە) کە دەڵێ: (ئاو زۆر شت دەشواتەوە، تەنها زمانی پیس نەبێت). لەم پەندەشەوە درک بەوە دەکەین کە زمان ئەگەر زبر بوو هەر بۆ گۆکردنی شتە پیسەکان بوو، ئەوە خاوەنەکەی دووچاری چەندین کێشە و گرفتە گوناهی جۆراوجۆر دەکات کە چارەسەرکردن و لێخۆشبوونیان ئەستەمە! دەی تا ئێستا چەند مرۆڤی بێتاوان بەهۆی زمانی پیس و بوختان و درۆ و دووزمان.. بوونەتە قوربانی؟! کەواتە هۆکار و ڕێگایەکی دیکەی سەرکەوتن ئەوەیە کە بزانین چی دەڵێین و زمانی خۆمان چۆن دەخەینە گۆوە.

* پەندێکی فنلەندی هەیە کە دەڵێ: (خۆشەویستی باخچەیەکە لە گوڵ). کەواتە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت ئاییندەی وەک باخچەیەک بێت کە پڕاو پڕ بێت لە گوڵە هەمە چەشنەکانی فەڕەحنایی، ئەوە پێویستە دۆستی خۆشەویستی بێت (هەڵبەت خۆشەویستی بە مانا فراوانەکەی). خۆشەویستی ژیانمان لێوان لێو دەکات لە باخچە، باخچەیەک کە لێوڕێژە لە هێزۆی یەکتر ویستن و شلێری تەبایی و دەمەشێری یەکدەستی.

* پەندێکی ڤێتنامی هەیە کە دەڵێ: (هەموو مەنجەڵێک سەرقاپی خۆی هەیە). ئەی هەموو زامێک هەتوانی خۆی نییە؟ ئەی هەموو کێشەیەک چارەیەکی خۆی نییە؟! بێگومان بەڵێ. کەواتە لەم پەندەوە ئەوە فێر دەبین کە هەر کاتێک دووچاری کێشەیەک بووین ئەوە بیر لە چارەیەک بۆ ئەم کێشە بکەینەوە، هەر کاتێک دەردێکمان تووش هات ئەوە بیر لە دەرمانی بکەینەوە، ئەم پەندە فێرمان دەکات کە هەموو دەرگایەک کلیلی خۆی هەیە، بۆیە هیچ پێویست بە نائومێدی و ڕەشبینی ناکات، چونکە ئێمە لە بەرامبەر دەرد، دەرمانمان پێیە، لەبەرامبەر زام هەتوانمان هەیە، بەڵێ لەبەرامبەر هەموو داخرانێک کرانەوەیەک هەیە. لە دوای هەموو ناخۆشییەک دڵخۆشییەک ئامادەیە.

* پەندێکی ئەڵمانی هەیە کە دەڵێ: (ئەوەی مۆمی کەسانی دیکە بکوژێنێتەوە، لە تاریکیدا دەمێنێتەوە). لەم پەندەوە فێری ئەوە دەبین کە مرۆڤ نابێت سەرچاوەی ڕووناکییەکانی مرۆڤەکانی دیکە بکوژێنێتەوە، نابێت جەور و ستەم لە مرۆڤەکانی دیکە بکات، چونکە ئەمانە هۆکار و ڕێگایەکن بەرەو شکستی دەبەن، نموونەت دەوێ؟ فەرموو بڕۆ سەرگوزەشتەی (فیرعەون و سەدام حوسێن و حوسنی موبارەک و موعەمەر قەزافی و ..هتد) بخوێنەوە. ئەمانە بۆچی بوونە میوانی تاریکی زبڵدانی مێژوو؟ چونکە مۆمی مرۆڤەکانی دیکەیان دەکوژاندەوە، بۆیە مۆمیان لەسەر کوژێنرایەوە، دەبا هەمووان لە خەمی ئەوە دابین مۆمی ژیانی هەریەکەمان هەمیشە گەشاوە بێت، چونکە ئەوکات مۆمی ژیانی خۆمان گەشتر دەبینین.

**وەڵامێکی برناردشۆ**

برناردشۆ گەورە نوسەری ئیرلەندا جارێکیان لە بازاڕ دەبێت، لەوێوە تەلەفۆن دەکات بۆ ماڵەوە بە خێزانەکەی دەڵێت چیت بۆ بهێنم و چیمان هەیە بۆ خواردن؟ خێزانەکەی لێی تووڕە دەبێت لەوەی درەنگانەو شەو نەگەڕاوەتەوە ماڵ بۆیە خێزانەکەی وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: ژەهری مارمان هەیە بۆ خواردن برنارد شۆ دەڵێ: باشە گیانەکەم تۆ نانت بخۆ من نانم خواردووە.

# وەهم..

هەڵمەت فوئاد

لەوە دەچێت لە ڕەوتی سوود گەیاندنی ئەرێنی دەربڕین ئەگەر بۆ هەموو شیکار و توێژینەوە و وردبوونەوەو خوێندنەوەکانمان، بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دەوری مرۆڤایەتیان داوە وەکو بوون، مرۆڤ بە لایەنی سەرەکی وەرنەگرین جا چ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. یان بڵێین مرۆڤ ئەو لایەنەیە کە نمایشی دەرەنجامی کارتێکردنەکانی پێکهاتەی سێگۆشەی (شتەکان و مرۆڤ و ڕاستی ڕەها) دەکات ئەم دەرەنجامەشە کە ڕەوت و جڵەوی کاروبارەکان و پێشهات و ڕووداوەکان کۆنترۆڵ دەکات بەرەو ئاراستەی دروست، هەڵبەتە لەو ساتە وەختەدا کە مرۆڤێک لە هەناوی ئەو سێگۆشەیەی سەرەوەدا کە بریتیە لە تاریکایی و نهێنی پێناسەی شتەکان و ڕەوشتەکان و دواتریش ڕاستی ڕەها، دووگیانە بە پێناسەی ماهیەت و حەقیقەتی شتەکان. تا ئەم حاڵەتە دەبێتە پاسادانی هەبوونی پێناسەیەکی تەواو دروست و ڕاستی (ڕاستی ڕەها) لە لایەن مرۆڤەکە، مەگەر هەر ئەوە نییە پەیدای زادی کۆنترۆڵکردنی ڕەوت و جڵەوی شتەکان و دونیای بوونی مرۆڤایەتی؟ ئەوە مرۆڤێک کە یەکەیەکە لە پێکهاتەی گشتی مرۆڤایەتی ئەی چی دەبێت کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی تێکرا بۆ هەموو شتێک پێناسەی دروستی لە لابێت، چونکە لە ڕاستی دا هەر شتێک (أ) حەقیقەتێکی هەیە کە بریتیە لە پێناس و ماهیەتی ئەو شتە، هەروەها بە شێوەیەکی بەردەوام بە هۆکاری دەرەکی یان ناوەکی ئەو شتە (کە ئەم هۆکارە ناوەکیانەش هۆکاری دەرەکی لێ بەرپرسە) هەمیشە پێناسەی وەهمی و خەیاڵی بۆ شتەکان دروست دەکرێت کە بریتی نییە لە حەقیقەت و ماهیەتی ئەو شتانە. لەو ساتەش دا کە پشت بە پێناسەیەکی ساختەو وەهمی شتێک دەبەسترێت بۆ مامەڵەکردن و بڕیاردان لە بارەی ئەو شتەوە بێ گومان دەرەنجامەکەی ساختەو وەهم دەبێت، پێناسەی حەقیقەتی شتێک بریتیە: لە تایبەتمەندییە فیزیکیەکانی ئەو شتە لە قەبارەو تواناو شێوەو ئەم پێکهاتە فیزیکیەش کلێشەی تواناو جۆری ئەدای ئەو شتە دیاری دەکات، با نموونەیەکی بەرجەستەو واقیعی بێنینەوە بۆ زیاتر شرۆڤەکردنی باسەکەمان: مەبەستمان لە (شتێک) هەرشتێکە کە لە بازنەی فراوانی (شیء)دا جێگای ببێتەوە بۆ نموونە ئۆتومبێل(أ) وەکو ئەو ماهیەت و حەقیقەتەی کە ئەم شێوە ئەندازەیی و ماددیە لە خۆی گرتووە، بەڵام ئۆتومبێل وەکو ئەوەی کە پەیوەندی و لێکخشانی هەیە بە ڕووی هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنی مرۆڤایەتی بریتیە لە قودرەتی مرۆڤ بە پەیبردن بە ئەو پێناسە حەقیقیەی کە لە ڕاستیدا ئۆتومبێل لە خۆی دەگرێت وەکو هۆکارێک بۆ گواستنەوە پاشەکەوتکردنی کاتە(+أ) یان

# خەرجی چاوی ملیاردێرێکی یابانی و عەقڵی دانایەک!

بەناز عەبدولڕەحمان

خوای گەورە ئینسان بە ناخێکی پاک دروست دەکات، بەڵام کۆمەڵە هۆکارەک هەیە ئینسان لە ناخی خۆی لادەدات دەبێتە هۆی قبوڵ نەکردنی دەور و بەرەکەی، بەڵام ئێمە خۆمان بگۆڕین یان دەور و بەر؟.
هەروەک دەگێڕنەوە: لە وڵاتی یابان ملیۆنێرەک هەبووە بە دەست چاو ئێشەوە گرفتار ببوو، بە تەواوی خەو لە چاوی تۆرابوو بۆ دەرمانی دەردی چاوی چەندان دەرمانی خواردبوو، چەندان دەرزی لە خۆی دابوو، بەڵام هیچ ئەنجامێکی باشی نەبوو، ئەو سەرەڕای ئەوەی هەموو ڕاوێژ و سەردانی پزیشکە زۆرەکانی دادی دەردی چاو ئێشەکەی نەبوو، سەردانی دانایەکی کرد ئەویش پاش تەمەشاکردنی چاوی کابرای پێی گوت: بۆ ماوەیەک جگە لە ڕەنگی سەوز نابێت تەماشای هیچ ڕەنگێکی تر بکەی، کابرای نەخۆش پاش ئەوەی دانای بەجێهێشت بەرەوماڵەوە گەڕایەوە، فەرمانی کرد تەواوی خانووەکەی سەوز پۆش کەن و هەروەها هەموو کەل و پەلی ماڵەکەی بگۆڕن بۆ ڕەنگی سەوز، پاش ماوەیەک فەرمانی دا بە گۆڕینی جل و بەرگی تەواوی ئەندامانی خێزانەکەی و خزمەتکارانی بە ڕەنگی سەوز و پاشان ڕەنگی ئۆتۆمبێلەکەش ئیدی هەر شتێکی بەبەر چاو دەکەوت دەبوو



بە ڕەنگی سەوز بگۆڕدرابایە، بەڵکو ئێشی چاوی نەمێنێ.
پاش ماوەیەک بۆ سوپاسکردنی دانایەکە بانگهێشتی کرد و میوانداریەکی بۆ سازدا، داناکەش بە بەرگێکی پرتەقاڵیەوە بۆ ماڵی ملیۆنێرەکە بەڕێکەوت، کاتێک هاتە ژوورەوە هەستی کرد دەبێت پۆشاکەکەی بگۆڕێت و پۆشاکی سەوز بپۆشێت، هەر بۆیە داوای پۆشاکێکی سەوزی کرد پاشان پۆشاکە سەوزەکەی پۆشی و چووە لای ملیۆنێرێچاو ئێشاو و لێی پرسی: ئازاری چاوت چاک بۆتەوە؟ دەوڵەمەندەکە سوپاسی کرد گوتی: بەڵێ بەڵام گرانترین دەرمان بوو کە تا ئێستا بە کارم هێنابێت، داناکە بە سەرسورمانییەوە گوتی: بە پێچەوانەوە! ئەمە هەرزانترین دەرمانە کە تا ئێستا نووسیومە، بۆ چاوت هەر چاویلکەیەکی شوشەی سەوزت بکڕیبایە ئەو هەموو خەرجییەی نەدەویست، تۆ بەم کارەت ناتوانی تەواوی دونیا بگۆڕی بەڵکو بە گۆڕینی جۆری ڕوانینت دەتوانی بە ئارەزووی خۆت ببینیت، ئێمەش دەڵێین تێڕوانینی خۆمان بگۆڕین نەک دەور و بەرمان، چونکی ئەوەی ئەتوو دەتەوێ سەدا سەد دەور و بەرەکەت ئەوها نابێت.



هەڵێنجانی پێناسەیەکی نەرێنی مرۆڤ لە ئەنجامی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئوتومبێل وەکو هۆکارێک بۆ خۆنمایشکردن و ئیعتیباراتی کۆمەلایەتی و چینگەرایی و پۆز لێدان و ..تد (ـأ).

# بەفیرۆدانی کات تاوانە

شلێر سەعدی

کات بەفیرۆ دان دەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە، کەواتە بابگەڕێینەوە خولەک و چرکەکان بژمێرین و ڕێکیان بخەین، چونکە خەڵک ئەتوانن کە زێڕو شتە گرانبەهاکان ئەنبار بکەن، بەڵام بەهیچ شێوەیەک ناتوانن کات ئەنبار بکەن، چونکە کات هەرگیز شایانی کڕین و فرۆشتن نییە. شتێکی سەرسورهێنەرە کەمرۆڤ هیچ حیسابێک بۆ کات ناکات، ئێستا گەنجێک دێتە لات تۆش لەگەڵی دادەنیشی چاوەڕێ دەکەی ئەو بابەتە گرنگەت بۆ باس بکات کەبۆی هاتووە..! باسی ناکات..! لەهەواڵی کەس و کاری دەپرسی، هەروەها لەهەواڵی موچەی دەپرسی؟ بیست پرسیاری لێ دەکەی ئەو هەرپرسیارێکت لێ ناکات تا مەغریب بانگ دەدات دەڵێ ئەوە سەردانێک بوو لەرێی خوادا! خۆشەویستی لەپێناوی خوا مەرجە عاقڵمەندانە بێ و هەرکەس بەکەیفی خۆی نەبێ، ئەگەر ویستمان سەردانی یەکتر بکەین، دەبێ کاتێکی گونجاو هەڵبژێرین ئەوکەسەی سەردانیشی دەکەین دەبێ پێی بڵێین، بۆ ئەوەی خۆی بۆ ئەو سەردانە ئامادە بکات.

بۆیە مامۆستا (حسن البنا) لە(مكتب) ەکەیدا لەوحەیەکی لەژوور سەری هەڵواسی بوو کە تیایدا نوسرابوو (الواجبات أكثر من لأوقات) بۆ ئەوەی میوانەکەی تێبگەیێنێ بەناڕاستەوخۆیی پێی بڵێ برای ئازیزم ئەرکەکانی سەرشانمان لەکاتەکانمان زیاترن، باکاتی یەکتر بەفیرۆ نەدەین، هەروەها گرفتێکی تر لە بەفیرۆدانی کات ئەوەیە کە زۆربەی گەنجان نازانن چ ئارەزووەکیان هەیەو لەچ بوارێکدا داهێنان دەکەن، چونکە خۆی تاقی نەکردۆتەوە، زۆربەی دەرونناسەکان وای بەباش دەزانن کە مرۆڤ خوێندنەوەیەک بۆخۆی بکا و خۆی بناسێ بزانێ لە چ بوارێک دا توانای داهێنانی هەیە نەک ئەو بوارەی کە لەتوانای ئەو دانییە.

ئەو چرکە ساتانەی کە ناتەوێ بەهەدەریان بدەیت ئەو تێشوەن کە بەهۆیەوە بەدڵ ڕەقی و توندوتیژی و ستەمکاریەوە روو بە رووی ژیانی پێ دەبێتەوە، ئەو چرکە ساتانەی کە دەست بەرداری خودی خۆت دەبیت تا بتوانیت خۆت هەڵبسەنگێنیت و رۆحت لە خەوش و پیسیەکانی ژیان پاک بکەیتەوە ئەوانە بەنرخترین ساتەکانی ژیان و گرینگترینیانە.

کەواتە رێ بەو ژیانە خێرایە مەدە ساتەکانت لێ زەوت بکات، چونکە لەدەست دانی کات گەورەترین لە دەست دانە لە ژیانی مرۆڤدا.



# کێسی پاشماوەی سەگەکان لەئەوروپا چی لەسەر نووسراوە؟

تاڤگە کەریم

لــە ڕۆژی نەورۆز خەڵکی بۆ بەرز ڕاگرتنی ئـەم یـادە بـەرەو سـەیرانگە و دیمەنـە جوانەکانـی هەرێمەکەیـان چـوون، بـەڵام پاش خۆشـی کردن و سـوود وەرگرتن لە گـوڵ و گوڵزار و شـاخ و دەشـت و ئاوی نیشتمانەکەمان تەنها ئەوەی زیانی پێکەوت ژینگـە قەشـەنگەکە بـوو، گەر لـە خۆمان بپرسـین کێ بەرپرسـیارە لە پیس بوون و تێـک چوونی ئەو ژینگە جوان و قەشـەنگە لەوانەیـە زۆربەمـان بڵێین شـارەوانی، کە لـە ڕاسـتیدا ئێمەیـن پـاش بەسـەربردنی خۆشیەکی زۆر لەو سەیرانگەیانەدا ئەوەی بـۆ سـەیرانگەکانی دەکەین پیـس کردن و تێکدانی سروشتەکەیەتی.

ئەگـەر وەکـو لێکۆڵەرەوەیـەک بچیـن و بگەڕێیـن و بەدواداچـوون بکەیـن داخـۆ هەر سـەیرانگاکان لەم حاڵـەدان؟ بێگومان نەخێر، لە هەر شـەقام و کونج و کۆڵانەکی ئـەم شـار و وڵاتـە بگەڕێین هەمـان پیس و پۆخڵـی دەبینیـن، هەرچەنـد شـارەوانی بـەردەوام لـە خاوێـن کردنـەوەی شـار دایـە، بـەڵام ناتوانێت خۆی بگرێـت لە بەر لێشـاوی پیسـکردنی کۆمەڵانـی خەڵـک، ئەم پیـس بوونی ژینگەیە هـەر لە فڕێدانی قوتو بیبیسـی لە جامـی ئۆتۆمبیل و کاغەز و کلێنـس و زەرف ناوەسـتێتەوە، بەڵکـو پیـس بـوون بـە مـاددە کیمیاییەکانی جل شـۆری و پاشـماوە و دوکەڵـی جگەرە و دوکەڵ و گازە نادۆستەکانی ژینگەی کارگە و ماڵـەکان... هتـد، زۆرجـار پیسـبوون لە خودی کەسـەکانیش دیـارە ئەویش بە دەم و ددانی پیس بوو بە جگەرە و زۆر خۆری، ناخۆشـی بـۆن و پیسـی جـل و بـەرگ و نینۆک درێژی و سەر و ریشی قژن و بۆنی گۆرەوی و بێ صبوغی پێڵاو و بۆنی سـیر و پیـاز لە دەم هاتن و... هتد، کەواتە ئێمەی تاکـی کۆمەڵگەیـن کـە پیـس و پەڵۆخیـن، لەمـەش زیاتـر نارێکـی شـێوەی ڕووی (واجهـە)ی خانـووەکان و پیـس و پۆخڵی بەردەم دوکانـەکان و بازارەکانمانە، ئەگەر زمانـی هەر یەکێکمان بکەیتەوە پر بە دەمی گلەیـی و گازاندە و باسـی بوونی گەندەڵی دەکات، ئـەو گەندەڵییەی کـە هەر یەکەمان وەکو هاونیشتمانی بەرپرسی یەکەمین پێش تاوانبارکردنـی لایەنـی دەسـەڵاتدار، بۆیە ئەوەی گرنگە هەریەکەمان بەخۆداچوونەوە بکەین و ئەو نیشـتمانەی بە دایکی دادەنێن بە پاکی و بەرزی ڕابگرین.

بۆیـە دایـک خۆشەویسـتە چونکـە تەنهـا دەبەخشـێت و هیـچ کاتێک درێغـی ناکات بەرامبـەر کۆرپەکـەی، بۆیـەش نیشـتمان و ژینگـە دایکـە، چونکە وەکـو دایک تەنها دەبەخشـێت بە هەوا و ئاو و دیمەنی جوان و بەرووبوو خاکەکەی، ئەوەی ڕێزی ژینگە نەگرێت وەکو ئەو کەسە وایە ڕێز لە دایکی نەگرێت.

ئێمەی مرۆڤەکان هاوبەشین لە هەوا و ئاوو خاک و دیمەنی پاک و خاوێنی و ڕێکی لەش و لاری کەسـەکان، گەر بە جگەرەکێشـێک بڵێیت بۆ جگەرە دەکێشیت؟ لەوەڵامدا دەڵێت خوا چەندی نووسیبێ ئەوەندە دەژیم، قەت بیر لـەوە ناکاتەوە ئـاو و هەوایەی ئێمەی پیس کردووە، کاکـی فیتەر بە خۆی و جلە بـە ڕوون و گریزەکەیـەوە سـواری پـاس و هۆیەکانـی هاتوچـۆ دەبێت، گەر لێشـی بپرسـی لەوانەیە زۆر بـە توڕەییەوە وەڵام بداتەوەو وەک ئەوە وایە بە چاوی سوکەوە تەماشـای خـۆی و کارەکـەی کرابێـت، لە کاتێکدا هـەم نـاو و ئۆتۆمبێلەکـە و هەم دڵـی خەڵکانێـک توند دەبێت بـە دیتنی ئەم رووکارە ناشـیرینە، کەسی ڕێبوار گوناهی چییـە دوکەڵـی سـەیارە و کارگـەکان و دوکەڵی جگەرەکێشـێک هەڵمژێ، شـێوە و ڕووخسـاری کاکی فیتەری ڕوناوی و بەر دوکانی کابرای ماڵ پەرست و زبڵخانەکانی بەناو سەیرانگە ببینێت.

سـەیر دەکەیـن لـە وڵاتـە ئەوروپیەکانی



وەكو بەریتانیا و سوید خەڵكی خاوەن شەهادەی بەرز روو دەكەنە كرێكاری شارەوانی، لای ئێمەش بە چاوی سووكەوە سەیری كرێكاری شارەوانی دەكرێت، لای ئەوان كرێكاری شارەوانی زۆرترین مانگانە و كەمترین كاتی ئیش و لێخۆش بوونی دەسەڵات لە زۆربەی باجەكانیان بۆ فەراهەم دەكرێت.
ئەگەر بێتو باس لە خاوێنكردنەوە بكەین لە یابان، لەوانەیە هەندێكمان بڵێین ستەمە ئەم بەراوردكردنە، ئێمە لە كوێ و یابان لەكوێ، بەڵكو ئەم باسە وامان لێدەكات كە بزانین كەم و كورتی ئێمە چییە لە رووی پاك و خاوێنییەوە و هانیشمان دەدات ئەگەر لەوان باشتر نەبین وەكو ئەوان بین، لەم وڵاتەدا بەیانیان كرێكارەكانی خاوێن كردنەوە راهێنانی وەرزشی دەكەن پێش چوونە كار بۆئەوەی بە چالاكییەوە كارەكەیان رابپەڕێنن، ئۆتۆمبێلەكان لایەكانی داپۆشراوە بۆ ئەوەی كەس نەیبینێت و ئازار نەخوات بە دیتنی ئەم دیمەنە لە هەر باڵاخانەیەك هەر رۆژە و یەك لە دانیشتووی ئەم باڵاخانەیە بەرپرسە لە تەسلیم كردنی پاشماوەی باڵاخانەكە، هەر رۆژێك و تایبەتمەندە بە جۆرێك پاشماوە، بۆ نمونە شەممە بۆ فڕێدانی پاشماوە كاغەزییەكانە كە دەتوانرێت لوول بدرێت و قەبارەكەی كەم بكرێتەوە، وەكو زانراوە پاشماوەی ماڵەكان بۆنی ناخۆشە، بەڵام ئەمە لە یابان نابینرێت، چونكە لەم وڵاتەدا هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوە كراون كە پاشماوەكان بە ئاوەوە فڕێ نەدەن، چونكە ئاو دەبێتە هۆی بۆگەن كردنی پاشماوەكان، لە قوتابخانەكان ئۆتۆمبێلی پاشماوەكان هەیە تەنها بۆ فێركردنی قوتابییەكان، تارادەیەك كە قوتابییەكان لە ناو یارییەكانیان ئۆتۆمبێلی زبڵیان هەیە، چونكە حەز دەكەن یاری پێ بكەن، كرێكارەكانیش بە كرێكاری پاك و خاوێنی ناوبردنیان شورەییە بەڵكو بە ئەندازیاری تەندروستی ناویان دەبەن، چونكە بەرپرسن لە تەندروستی خەڵك و ژینگە، هەر كرێكارێك مانگانە ٨٠٠٠ یۆرۆ وەردەگرێت.
داخۆ لە گەڵ پاشماوەی گیانەوەران چۆن مامەڵە دەكەن؟ هەر كەسێك سەگی پێبێت كیسێكی لە گەڵە، پاشەڕۆی سەگەكەی دەكاتە ناوی و كە گەڕاوە ماڵەوە فڕێی دەداتە ناو زبڵخانە، لە سەر كیسەكەش نووسراوە رەوشتی بەرز، لە قوتابخانەكان قوتابییەكان بۆ ماوەی چەند كاتژمێرێك پێش دەست كردن بە خوێندن قوتابخانە خاوێن دەكەنەوە، ئەمەش هەستێكی خۆش لای قوتابی دروست دەكات و بە هیچ شێوەیەك قوتابخانەكەی پیس ناكات، لە پاركەكان كیسی فڕێدراوەكان نییە بەڵكو هەر منداڵێك و گەنجێك و پیرێك لە گەڵ خۆی كیسێكی پێیە بۆ خستنە ناوی پاشماوەكان، ئەوەی ماوە بیڵێین ئەوەیە كردەوەكانمان ئاوێنەی رەوشت و ناخمانە.



# واقیعی مرۆڤ بە ئاسانی ئاشكرا دەبێ

**پەیمان سعدی**

تائێستا بە بەردەوامی گوێمان لەوە دەبێت كە لە كاتی چوون بۆ گەشت، سەیرانگاكان بپارێزین و زبڵ فڕێنەدەین لە ناوپاس و لە نەخۆشخانەكان یادگاری نەنووسین، لە قوتابخانەكان لەسەر كورسی و مێزەكان خشتەی لێكدان و داڕشتن و پێناسەو ناو وژیانی شاعیران و ناوی یاریزانان نەنووسین دارو تەختەی قوتابخانە نەشكێنین ..هتد.
بەڵام ئەمانە تەنها قسەیە و هیچی تر لە پارك و هەر شوێنێكی گشتی رۆژانە هەمان شت دووبارە دەبێتەوە بەبێ گوێدانە پیس بوون و كاول بوونی شوێنەكان و بێ هەست كردن بە بەرپرسیاریەتی .
بۆیە لەكۆتاییدا دەڵێم دەبێت هەموومان بەیەكەوەو هەریەكە لەلای خۆی دەست پێبكات و بەم بەسەرهاتە كۆتایی بەبابەتەك دێنم (جارێك گەورەی گوندێك داوا لەخەڵكی گوندەكەی دەكات كە ئەمشەو هەتا بەیانی ئەم حەوزە پڕ بكەن لەشیر هەریەكێك لەئێوە یەك پەرداخ شیر بكاتە ناو حەوزەكە! خەڵكی گوندەكەش هەریەك لەلای خۆی بیری كردەوەو گوتی: باشە بەپەرداخێك شیری من چی دەبێت!؟ با لەجیاتی شیر پەرداخێك ئاو بەرم خۆ كەس نازانێت، بۆیە بەیانی گەورەی گوندەكە بینی كە حەوزەكە تەنها ئاوی تێدابوو تەنانەت رەنگیشی نەگۆڕابوو)! ئەمەش لەئەنجامی هەست نەكردن بەبەرپرسیاریەتیە، لەكۆتایی دا دەپرسم ئایا كێیە؟ من! تۆ! ئەو! هەموومانین.

رۆژێكیان دوو كچ بۆ دامەزراندن واتە تەعین بوون دەچن بۆ دائیرەیەك، یەكیان زۆر جوانە یەكیان زۆر ناشیرین بوو.
مدیر دەیەوێت كچە جوانەكە دامەزرێنێت، ناشیرنەكە دەربكات.
روو لە كچە جوانەكە دەكات دەڵێ: وڵاتی جەزائیر چییە؟ دەوڵەتی ملیۆن شەهید.
روو لە كچە ناشیرنەكە دەكات دەپرسی.. ناوی ئەو ملیۆن شەهیدە چییە؟

# با خۆمان بناسین

**هیوا مەرزانی**

جارێک لە ئەندازیارێکی بیناسازییان پرسی ئایا باشترین مەوادی سەرەکی کامانەن تا کۆشکێکی پتەو و خۆڕاگر و ڕێکی لێ دروست بکەین؟

ئەویش گوتی: لەراستیدا ئەگەر ئەو کەسەی نیازی دروستکردنی کۆشکێکی بەرز و جوانی هەبێ، دەکرێ بە قوم و چەگڵ و چیمەنتۆ و شیش و بەردی حەلان... تد جوانترین خانوو دروست بکات، بەڵام بەهاوینان بۆ فێنککردنەوە پێویستی بە چەندین ساردکەرەوە و زستانانیش پێویستی بە چەندین گەرمکەرەوە دەبێت، بۆیە دەبینین لە هەردوو وەرزدا ئەم خانووانە پێویستیان بە تێچوونێکی زۆر هەیە تا بگونجێ بۆ بەسەربردنی ژیان تیایاندا، کەواتە ئەم جۆرە خانووانە پێچەوانەن لەگەڵ ئەو خۆشگوزەرانییە بەردەوامەی ئێمە پێویستیمان پێیەتی.

دووبارە رووی پرسیاریان ئاراستەی ئەندازیارەکە کردەوە، گوتیان: بەڵێ راستدەکەیت بەڵام چی بکەین باشە؟

گوتی باشترین کەرستە بۆ دروستکردنی خانووبەرە لەهەر شوێنێک بێ بریتیە لەو مەوادانەی کە لەناو خاکەکەی ژێرخۆیدا هەیە، چونکە ئەو ماددانە بەتەواوی گونجاون لەگەڵ کەش و هەوای وەرزەکانی ساڵ، دەکرێ لەهەمان ئەو ماددانەش داهێنان کاری و جوانکاری لێ دروست بکرێ، بەڵام ئەمەیان پێویستی بە ئەندازیاری زۆر شارەزا دەبێ.

کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە بەڵێ (بەرد لەجێی خۆی سەنگینە)، ئێمەی ئادەمیزادیش پێویستە کەسایەتی خۆمان و منداڵەکانمان لەسەر ئەو زانست و زانیاری و شارەزاییانە بناغەی بۆ دابنێین کە لە بنەچەدا وەک توانییەک هەمانە، تاخۆڕسکانە و خوازسکانە کەسانی پسپۆڕ و شارەزامان لێ دروست بێ و مەردانە رۆڵی مرۆڤانەی خۆمان ببینین لە ئاوەدانکردنەوەی ناخی خۆمان و کەسانی تر و رازاندنەوەی ژیان بەگشتی.

زۆرکەس هەیە دەڵێ من کەسێکی بێ توانام و ناتوانم بگۆڕێم تا بەرهەمێکی سوود بەخش پێشکەش بە ژیان بکەم، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە کاتێک راستە ئەگەر کەسێک خۆی نەناسیبێ و هەوڵیشی نەدابێ خۆی بناسێ، خۆ ئەگەر سەیرێکی خۆی بکات



دەبینێ هەر لەمنداڵییەوە بە هەوڵدانی بەردەوام توانیویەتی گاگۆڵکێ بکا و پاشان بڕوات و هێدی هێدی فێری قسەکردنیش بێ، ئەمەو چەندین نموونەی تر لە ژیانماندا هەیە.

ئەگەر چاوێک بەدەوروبەری خۆماندا بخشێنین دەبینین هەرچی دروستکراوی دەستی ئادەمیزادە بە هەوڵدان و تاقیکردنەوەی بەردەوام بەرهەم هێندراوە، هیچ کەسێکیشیان وەک مرۆڤ ئەندامێکی لەشیان لە ئێمە زیاتر نییە بگرە زوربەشیان بە بارو دۆخی ئابووری و تەندروستی و رامیاری و کەش و هەوای زۆر سەختیشدا تێپەڕیون.

ئەگەر لەڕوانگەی ئایینییەوەش خوێندنەوەیەک بۆ زیرەکی و تواناکانی خۆمان بکەین دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە خالقی بوونەوەر(خودا) کاتێک کەسێک وەک جێنشینی خۆی لەسەر زەوی دیاری دەکات، دەبێ ئەو کەسەی چۆن خەلق کردبێ کە شیاوی جێنشینی ئەو بێ؟! بێگومان خودا هەموو مرۆڤەکانی لە بناغەدا وەک جێنشین خەڵق کردووە، هێز و تواناو زیرەکییەکی ئەو تۆشی لەناخیدا چاندووە کەبتوانێ رۆڵی ئەم جێنشنیە ببینێ، تەنها ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە بەهەموو شێوەیەکی ڕێک هەوڵبدەین تا تواناکانمان بدۆزینەوە و گەشەیان پێبکەین، بۆ ئەوەی دواتر گلەیی لە خۆمان نەکەین لەکاتێکدا تەمەنێکی زۆرمان لە پێش ماوە.

**رۆژێك كابرایەك خەون دەبینێ لە خەونی سیم كارتەكەی خۆی (١٥) وەرەقەی دەدەنێ نایدا، لە ناكاو بە خەبەر دێ دەبینی خەوە، دەڵێ وەڵڵاهی ئەوجارە دەنووومەوە (١٠) وەرەقەشیان دامێ دەیدەم.**

# لە مامۆستاکەی فێری چی بوو؟

حەسەن عەلی

حەکیمێکی صینی قوتابییەکی هەبوو، ئەم قوتابییە بەردەوام گلەیی هەبوو لە هەموو شتێک و هەموو ڕووداوێـک و لە هەموو کاتێک، تا وای لێهات هەموو دەوروبەری لێ دوور کەوتنەوە، تەنیایی بەسەریدا زاڵبوو، چووە لای ماموستاکەی گلەیی حاڵی خۆی بۆ مامۆستاکەی باس کرد گوتی: خەڵکی منیان خۆشناوێ ئیرەییم پێ ئەبەن، بەڕێگەدا ڕۆیشتن تاگەیشتنە ڕێگایەک مامۆستاکەی بە قوتابیەکەی گوت تۆ لەم ڕێگایەدا بڕۆ منیش لەم سەری ڕێگاکەدا چاوەڕێت دەکەم، قوتابییەکە بەسەرسوڕمانەوە گوتی: بۆچی من ئەم ڕێگا تاریکە ببڕم؟ ئەم ڕێگە ڕووناکە بەجێ بهێڵم؟ چونکە ڕووناکی تێدایە دەتوانم بەئاسانی تێیدابڕۆم. بـەڵام مامۆستاکە وەڵامی قوتابییەکەی نەداوە. بۆجاری دووەم پرسیاری لە قوتابییەکەی کرد؟ پێی گوت تۆ بەم ڕێگایەدا بڕۆ، منیش لەکۆتاییەکەی ئـەم ریـگـایـەدا چـاوەڕێـت دەکــەم، لێرەدا قوتابییەکەی بەتەنیا جێهێشت قوتابییەکە بە ناچاری ملی ڕێگای گرتە بەر و دەستیکرد بە ڕۆیشتن، بەڵام ڕێگایەک بە ڕاستی زۆر تاریک بوو، بە جۆرێک بوو نەی دەتوانی هیچ شتێک ببینێت، بەڵکو کەم کەمە وای لێهات پێش خۆی لێ دیار نەبوو. و قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد دەیگوت بۆچی ئەم داوایـەی لی کردم کە بەم ڕێگەیە بڕۆم؟ ئایا ئەوە تاقیکردنەوەیە یان مامۆستا بەتەمەنداچووە یان خەلەفاوە؟ لەوبیرکردنەوە دابوو قسەی لەگەڵ ناخی خۆی دەکرد، بە هێزێکی زۆر بەردیوارێک کـەوت بـووە هـۆی ئازارێکی زۆر لە سەری، بۆیە پڕ بە دەنگی هاواری کرد، لەو شوێنە دوورکـەوت و ئەو چووە شوێنێکی تـر نـەیزانی چـۆن لـەم شوێنە دەربچێت و نەیزانی لە کام ڕێگا هاتووە و بۆ کام ڕێگە هاتووە! بۆکام ڕێگە دەڕوات! لەو کاتانەوە توڕەییەکی زۆری بەرامبەر مـامۆسـتـایـەکـەی بـۆ دروسـت بـوو، بۆیە بیرکردنەوەی هەمووی بووە بیرکردنەوەی نێگەتیڤانەی نەرێنییانە، بۆیە یەکسەر بەر دیوارێکی تر کەوت ئەمجارە تەواو کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دا. دەستی بە قسەی ناشیرین کرد بە مامۆستاکەی تا کار گەیشتە جوێندان و قسەی بێ مانا و لۆمەکردنی خۆی چۆن بە قسەی ئەم خەلەفاوەی کردووە؟ هەرلەم قسانەدابوو، بەرەو ڕێگایەکی تر هەنگاوی نا تا کەوتە ناوچاڵێکی زۆر قوڵ هـاوار و دەنگێکی بەرزی لێ هەستا، چونکە لەناکاو کەوتە ناو ئەم چاڵە، ئەم جـارە بەهاوارو دەنـگـی زۆر بــەرز قسـەی ناشیرینی بە مامۆستاکەی دەگـوت! کەئەو بـووە هۆی گەیشتنی بەم حاڵە.



ویستی بێتە دەرەوە بەڵام نەیتوانی، چونکە چاڵەکە زۆر قووڵ بوو، ئیتر دەستیکرد بە گریان بۆ حاڵی خۆی، دانیشت و وایزانی ئەمە کۆتایی ژیانیەتی بۆیە یەکسەر لەهۆش خـۆی چـوو لـەبـەر زۆری ئـازارەکـەی و هەستکردن بەنائومێدییەکی زۆر، بەڵام پاش چەند کاتژمێرێک بەهۆش خۆی هاتەوە، بە دەنگێکی زۆر بەرز هـاواری کرد یارمەتیم بدەن! پاش هەوڵدانێکی زۆر و هاوارکردنێکی زۆر بینی چرایەکی ڕووناکی بەرەو لای ئەو دێت، زۆر خۆشحاڵ بوو، بۆیە بەدەنگێکی بەرزتر هاواری کرد! وەرن فریام کەون کەم کەمە چرایەکە لێی نزیک بۆوە، کەسەیری کرد بینی ئەوە مامۆستاکەیەتی! چرایەکی لەدەستەو بەرامبەری وەستاوە یارمەتیداو ڕزگـاری کرد، کە هاتە دەرەوە قوتابییەکە بە مامۆستاکەی گوت ئەمەوێت بزانم بۆ وات لێکردم؟ مامۆستاکە وەڵامی نەدایەوە، قوتابییەکە هەمان پرسیاری لێکردەوە بەڵام بەدەنگێکی بەرز، کەچی مامۆستاکەی زۆر بەهێمنی پێی گوت چی لەم تاقیکردنەوەیە فێر بویت؟ قوتابییەکە بەتوڕەییەوە گوتی: ئیتر نابێت گوێم لە قسەی کـەس بێت و بەگوێی کەسیش ناکەم، مامۆستایەکە وەڵامی نەدایەوەو کەوتە ڕێگە ئینجا قوتابیەکە بیری کـردەوەو چووە بەرامبەر مامۆستایەکەی، گوتی: مامۆستا ئێستا زانیم کە وانەیەک هەیە لەم ڕووداوە بەڵام داوای لێبوردن دەکەم، چونکە بەڕاستی ئازاری زۆرم کێشا، بۆیە داوات لێدەکەم کە فێرم بکەیت و ئامۆژگاریم بکەیت، لێرە مامۆستایەکە ڕاوەستاو گوتی: ئەی قوتابی! ئێستا تۆ فێری وانەکە بویت ئەوە بوو وانەی تۆ. ئەمە ڕەفتاری کۆتایی تۆ بـوو وای کـرد وەڵامـت بـدەمـەوە، ڕێگا تاریکەکە ئـەوەی ئاماژەم بۆ کردی کە تۆ پێیدا بڕۆیت هەموو نمونەی ئـەم بیرۆکە نەرێنیە بـوو. ئەو دیـوارەی کەسەرت پێی کەوت هەموو ئەنجامی کۆکردنەوەی بیرۆکە نەرێنیەکانت بـوو، ئەو چاڵەی کە کەوتیتە نـاوی ئەویش خـۆی لە خۆیدا کۆکـراوەی هەموو بیرۆکە نەرێنیەکانت بوو )

ئینجا چووە پێش لە قوتابیەکەی سەیری نێوچەوانی کرد گوتی: ئەوەیە(بیرکردنەوەی نـەرێـنـیـانـە)، کـە مـرۆڤ وا لـێـدەکـات کە چاوەکانی ڕێگەی ڕووناکی نەبینن، بەڵکو لەناو ئەشکەوتی تاریک تاریک دەخولێنەوە و ڕێگەی دەرباز بوونیان لی ون دەبێت و بەر هەموو ئەو شتانە دەکەوێت کە ئازارای دەدەن و هەستی دۆڕانـدن و لەناوچوون وتـوڕەیـی لا دروسـت دەبـێـت، بـۆیـە گەر دەتـەوێـت فێرە دانایی(حیکمەت)بیت باش بزانە کە لە ناختدا گەورەترین دوژمنت هەیە ئەویش بیرۆکەی (نێگەتیڤانە)یە گەربتوانیت کۆنترۆڵی بکەیت ئەوا بۆ بەرژەوەندیەکانت بەکاردێت، بۆیە دەڵێت: (بیرۆکەی نەرێنییانە ئەگەر بیگریت و کۆنترۆڵی بکەیت مێشێکە بەڵام گەر لەدەستدا دەشتێکە) بیرت نەچێت بیرۆکەکانت هەمووی دروستکراوی خۆتە، هیچ هێزێک لە دونیادا بتوانێت بیگۆڕیت، بۆیە هەرخۆت بەتەنیا توانای گۆڕانت هەیە تالە بەرژەوەندی خۆت بەکاری بهێنیت بۆ خزمەتی هەموو بوونەوەر.

# ئەگەر ونبووی بەچ ڕێگایەك خۆت دەدۆزییەوە؟

دەروون ئەحمەد

بۆیەکەم جار بۆ دەرەوەی هەرێم خۆم و خێزانم گەشتێکمان ئەنجامدا، بەڵام لە دوورەوە جگە لەچەند زانیاریەکی سەرەتایی لەسەر ئەم وڵاتە هیچی ترمان نەدەزانی، زمانیان بەتەواوی لەگەڵ زمانی ئێمە جیاواز و لەیەکتر تێنەدەگەیشتن، نەهیچ شوێنێک پێدەزانین و نەدەشتوانین بەپرسیارکردن بیدۆزینەوە، تەنانەت نەماندەزانی چۆن سوود لە هێڵەکانی هاتووچۆ وەربگرین و هیچ پارەیەکی ئەو وڵاتەمان پێ نەبوو و نەماندەزانی لەکوێ و چۆن پارەی خۆمان بگۆڕینەوە.

بەهەرحاڵ ئەو شەوەی گەیشتینەجێ هاو وڵات و هاوزمانێکی خۆمان ئێمەی گەیاندە ئەو شوقەیەی کە پێشتر بۆمانی بەکرێ گرتبوو، بەڵام ئەو لەبەر ئیش و کاری خۆی نەی دەتوانی لەگەڵمان بێ تا شوێنەکانمان پێ بناسێنێ.

ناچار دەبوایە پشت بەخۆمان ببەستین و ڕێگەچارەیەکیش بدۆزینەوە بۆ ئەوەی ئەو شوێنانە بدۆزینەوە کە مەبەستمانە سەردانیان بکەین، لەناکاو شتێک بەبیرمدا هاتەوە کە لە گیانلەبەرێکی بچووک فێرببووم، ئەو گیانلەبەرەی لە وڵاتی خۆمان هەرهەست بەبوونی بکرێ ئەوا یەکسەر بەدوایدا دەگەڕێن و دەیکوژن، کەچی ملیۆنەها ئادەمیزاد بەهۆی ئەم جۆرە گیانلەبەرە لە نەخۆشی ڕزگاریان بووە(بەهۆی ئەو هەموو تاقیکردنەوەی لەسەریان دەکرێ)، ئەوە جگە لە بنەماکانی پەروەردەکردنی منداڵ لەلایەن زۆرێک لەزانایانی دەروونزانی لەم گیانلەبەرەوە فێربوون، (تەنانەت لەلای کەسانێکی زۆر ئەم گیانلەبەرە ئەوەندە بەڕێز و پیرۆز و موبارەکە گەیشتۆتە ڕاددەی پەرستن، ئەگەرچی شتێکی نادروستە بەڵام نرخی بۆ دادەنێن)، ئەم گیانلەبەرە(مشکە).

بەبیرم هاتەوە ڕۆژێک لە حەوشیماڵەوە مشکێکم بینی دەیویست شارەزایی پەیدا بکات لە نێو ماڵمان، بۆ ماوەیەک بەدیاریەوە چاوەڕێم کرد، بینیم کاتێک دەچوو تاکو پارچە نانێک بدۆزێتەوە، بەچەند قۆناغێک دەگەیشت بە پارچە نانەکە، سەرەتا چەند سانتیمەترێک لە شوێنی خۆی دوور دەکەوتەوە و بە پەلە دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، بۆجاری دووەم چەند سانتیمەترێکی زیاتر دەچووە پێش و بەهەمان شێوەی پێشوو بەپەلە دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، بەم شێوەیە هەرجارە و چەند سانتیمەتر دواتر چەندین مەتر دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە هەمان شوێنی جارانی خۆی، تا شارەزایی تەواوی پەیداکرد و گەیشت بەو ئامانجانەی کە بۆخۆی دیاریکردبوو، ئەوەبوو منیش هێدی هێدی لەسەر هەمان شێوازی ئەو گیانلەبەرە بچووکە سەرجەم ئەو شوێنانەی مەبەستم بوو دۆزیمەوە بگرە شارەزاییم لە زۆر شتی تر پەیداکرد، تەنانەت لەم ماوە کورتەی کە کەمتر لە مانگێکی خایاند وردە وردە لەکاتی قسەکردنیان بەزمانی خۆیان لێیان تێدەگەیشتم، دڵنیام ئەگەر زیاتر بمابوومایەوە ئەوا بەتەواوی شارەزاییم لەسەر زمان و چۆنیەتی مامەلەکردن و کەلتووری ئەو نەتەوە و وڵاتە پەیدا دەکرد.

ئەمەو هەر زیندەوەرێک چەندین یاسا و سیستەمی بەڕێوەچوون و شارەزایی تایبەت بەخۆی هەیە، ئێمەش دەتوانین سوودیان لێ وەربگرین بۆ ئەوەی پەرە بە تواناکانمان بدەین. کەواتە هەموومان لەتوانامانـدا هەیە بە ئاسانی سەرجەم دەوروبەرمان بناسین ئەگەر بمانەوێ، ئەگەرنا تواناکانمان بەپێنەگەیشتوو دەمێننەوە و نەک هەر لەگەڵ کاروانی ژیان ڕێناکەین بەڵکو دەبینە بار بەسەر کەسانی تر



# لە بری ژەمێک ماسی فێرە ماسی گرتنم بکە

خێریە محمد ئەمین

ئەم پەندە گوزارشت لە چارەی کێشەیەک دەکات لە ژیانی رۆژانەمان کە بە کۆمەڵێک مانای جیا جیا دەردەکەوێت، سەرەتا خۆی هەر چارەکردنە لە جیاتی سڕکردن، ئینجا کار راپەڕاندنە لە بری کار بەڕێکردن، راهێنانە لە بری کار لە جیاتیکردن، بەرهەمە لە بری‌کات بەفیڕۆ بردن، رێکخستنە لە بری ئاڵۆزی، بەردەوامییە لە بری کاتی.
ئایا ژیانمان بەم شێوەیە بەڕێوە دەچێت؟ ئەوە هەمووی بۆ خۆت وەکو تاکە کەس، ئەی کۆمەڵگە و سیستەمە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان چی؟ لە بواری تەندروستی نەخۆشەکە چۆن بیر دەکاتەوە کاتێک نەخۆش دەبێت؟ پێش نەخۆشی چۆن بیری کردۆتەوە و هەڵسوکەوتی کردووە لەگەڵ خواردن و خواردنەوە و وەرزش و هێمنی و ئاسودەیی دەروونی و...هتد، کە ئەوانە بەشێکن لە نەخۆشی، لەولاشەوە پزیشکەکە چۆن مامەڵە لەگەڵ نەخۆشییەکە دەکات؟ ئەوەندەی گرنگی بەدەرمان دەدات گرنگی بە روونکردنەوەی نەخۆشییەکە و هۆکارەکانی دەدات؟ چونکە بنەبڕنەکردنی هۆکاری نەخۆشی ئەگەری دووبارە بوونەوەی لە ئارادایە. لەلایەکی تر ئایا مامۆستا ئەوەندەی گرنگی بە خستنەڕووی زانیاری دەدات ئەوەندە گرنگی بە چۆنیەتی فێربوونی زانیاری دەدات؟ کە ئەوەی دووەمیان راهێنانە و بەبێ مامۆستاکەش قوتابییەکە دواتر توانای خۆفێرکردنی دەبێت. ئەوانەو لایەنی تریش کە ئەگەر بیری لێبکەینەوە نموونەی زۆرمان بۆ ئاشکرا دەبێت.



لە زانستدا زاراوەیەک هەیە پێی دەگوترێت پرۆگرامساز و بەرنامەیەک دادەڕێژێت بۆ ئەوەی بە کەمترین کات و بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی سوودێکی زۆر ببەخشێت بە کارێک لە کارەکان. دەکرێت ئێمەش ئەوەی پەیوەندی بە ژیانمان هەیە پرۆگرامی بکەین، دەزانی چۆن دەکرێت؟ فێربە و فێرکە ئامانجت بێت لە جیاتی تێربە و تێرکە مەبەستت بێ.

# رێچکەی پێشینان

خالیس محمد

یەکێک لەو مەسەلانەی کە کۆمەڵگەکەمان پێوەی دەناڵێنێ بریتییە لە رێچکەی باوباپیران، بێگومان زۆرێک لەو شتانەی کە باوباپیران لەسەری رۆیشتوون شتی رەسەن و بە سوود و باش بووینە، لێ کۆمەڵێک شتیش هەن مەرج نییە راست بن لەوەشەوە لەوانەیە شتی بێ سوود بن، بۆ نموونە:
دەمارگیریی، کە دەردێکی کوشندەیە و زۆرجار دەبێتە ستەم لە کۆمەڵگە تەنانەت تاکیش، یان لەوانەیە لەزۆر شوێن دوژمنکاریشی لێکەوتۆتەوە تا رادەی خوێن رشتن، ئەویش جۆری زۆرە وەک دەمارگیری هۆزایەتی و نەتەوایەتی یان دەمارگیری بۆ بیرو باوەڕ کە لەوانەیە هەوڵی سڕینەوەی بەرامبەر دراوە، ئەوەی باوە دەمارگیری بۆ هۆز و کەسوکار کە تاکەکان لەوانەیە دەستیان لە مەسەلەیەک نەبوو بێت، بەڵام باجێکیان داناوە بە ناوی خزمایەتی! ئەم دەردەش پێویستی بەوەیە خەڵکی لە رەگەوە بیروباوەڕیان بگۆڕێت.

لەلایەکی دی هەندێک داب و نەریت هەیە لە ناو خەڵکی کە بۆتە فەرهەنگی کۆمەڵگەکەمان، زۆرێکی جێگەی شانازییە و هەندێکی جێگەی پێداچوونەوەیە، یان جێگەی پرسیارە، هەر لە بنچینەدا بۆچی ئەم رەفتار و تێڕوانینانە لە نێومان بوونی هەیە، جا چ لە خودی خۆمان هەبێت یا بە دەستمان هێنابێت، دەمارگیریش هەندێک سیفات لەگەڵ خۆی دێنێت بۆ تاکەکان بۆ ئەوەی بتوانین پیادەی بکەن، کە کێشەکە قوڵتر دەکاتەوە و دەیکاتە چەند لایەنە.
دەرچوون لەو قاوغەی بۆمان دانراوە خاڵێکی گرنگە، چونکە مرۆڤەکان مرۆڤن و ئامێرێک نین بەدەست کەسەکانەوە تا ئاراستەی ژینمان لە دەستی کەسانی ترەوە بێت، چونکە ئەم حاڵەتە لە مرۆڤبوونمان دەردێنێ و دەمانکاتە تەنیا یارییەکی دەستی ئەوان و کەسایەتیمان دەسڕێتەوە، ئەوەی پێویستە بیکەین سوود لە رابردوو ببینین و لە ئێستا بژین و هەنگاو بۆ دوارۆژ بنێین.

# لاسەنگیی شیرازەی خێزانی بەدواوەیە

**بەڕێوەبەری نووسین**

ئایا کێ لە ئێمە هەوڵی داوە خۆی بێنێتە جێگەی منداڵێک کە تووشی کارەساتێک هاتووە، زۆرێک لە خەڵکەکان گوێ بە گەورەو و بچووکیش نادەن، جا تووشی کارەساتێک بووبێ یان لە خەمی ئەوە بێت کە کەسەکە خۆی نەبێتە مایەی ئازار و کێشە بۆ کەسەکان جا چ منداڵ یان گەورە، لێ بارێکی تر هەیە کەسە نزیکەکان ئەوان ببنە مایەی ئازار و ئەشکەنجە بۆ رۆڵە و نەوەکانیان، بۆ نموونە خودی دایک و باوکەکان! واتە دایک یان باوک ئەوان ببنە مایەی کێشە و ئازار بۆ منداڵەکانیان، چونکە لە بنچینەو راستیدا دەبێت ئەوان کار بۆ ئەوە بکەن نەوەکانیان لە کەشێک بگوزەرێن کەوا پڕ بێت لە سۆز و خۆشەویستی و ئارامی، چونکە هەر تاکێک خۆی تاکە خاوەن وخاوەن ماف نییە بەسەر خۆیدا، ئەمەش پەیوەندییەکی دولایەنەیە، واتە هەر کەسێک ئەرکی هەیە و مافیشی هەیە، ناشێت و نابێت کەسێک تەنیا ئەرکی هەبێت و مافی نەبێت.

لەسەر ئەو بنەمایەی سەرەوە دایکان و باوکان هەر لەو ساتەوەی بڕیاری پێکهێنانی خێزانێک دەدەن دەبێ بیر لە هەموو لایەنەکان بکەنەوە، چونکە خێزانی سەرکەوتوو دەبێ ئەرک و مافەکان بزانن، کاتێکیش خێزان پێکهێنرا باری ئاسایی ئەوەیە منداڵیان هەبێت، بێگومان ئەو منداڵەش دەبێ کەشێکی ئارامی بۆ فەراهەم بکرێت، بەڵام ئەگەر خێزانێک نەتوانێت لەمەدا سەربکەوێت، بێگومان هەموو هەوڵ و تێکۆشانێک دەبێ بدرێت بۆ بەدیهێنانی ئەم ئەرکە لەلایەن هەموو لایەنەکانەوە، چونکە دابڕانی خێزانێک لەیەکتر گەلێک کێشەی هەیە، مەبەست لێرە باسی منداڵەکان لە نێو خێزانێکی لەم جۆرەیە، واتە پێویستە نەهێڵدرێت ئەم کارەساتە روویدات، بەڵام ئەگەر روویدا ئەوا کاریگەریی و خراپییەکان لەسەر منداڵەکان کەم بکرێتەوە، چونکە ئەمە کێشەی دەروونی لەسەر ناخی منداڵەکان دروست دەکات، بەڕاددەیەک ئەو منداڵانە کە دەگەنە تەمەنێکی پێگەیشتووش زۆر زەحمەتە ئەو حاڵەتە بێننەوە بەرچاو و بیری خۆیان، چونکە بە درێژایی تەمەن دەبێتە برینێک و ئازارێکی نەبڕاوە لە مێژووی ژیانی ئەو منداڵە.

بەڵام ژیانیش هەر بەردەوامەو کەسەکان دەبێ لە بەرامبەر روداوەکان خۆڕاگر بن بە ڕاددەیەک خۆڕاگرییەکە لە کارەساتە گەورەکانیش گەورەتر بێت، هەر مرۆڤێک تووشی کێشە و گیروگرفتێک بێت و ئاڵای سپی هەڵبدات ئەوا دەبوایە تا ئێستا ئاڵای سپی سەری هەموو مرۆڤەکان دابپۆشێت.. رەنگەکان هەموو بگۆڕێن و تەنیا یەکێکمان لێ دیاربێت ئەویش ئاڵای خۆ بەدەوستەوە دان، بەڵام موژدە ئاڵاکان رەنگاورەنگن.

لە ژورێک چەند کەسێکی لێبێت دوانیان کێشە و ئاژاوەیان بکەوێتە نێوان ئەوا کاریگەری دەبێت لەسەر هەموو ئامادەبووانی ژوورەکە، بۆیە بوونی کێشەو گیروگرفت لە ناو یەک خێزان کاریگەری زۆری لەسەر ئەندامەکانی ئەو خێزانە دەبێت، لەلایەک بەهۆی پەیوەندییە بەهێزەکەیان کە دایک و باوک و خوشک و بران، لەلایەکی تر ئەوان لەگەڵ یەک دەژین، کاریگەرییەکانیش لە چەند بوارێک خۆی دەبینێتەوە، جا هەندێکی زوو دەست دەکات بە دەرکەوتن و هەندێکی لە دوارۆژ دەردەکەوێت و دەبێتە بەشێک لە کەسایەتی منداڵەکان، بۆیە دایک وباوکان بە پلەی یەکەم پێویستە بزانن چۆن هاوسەری ژیانیان هەڵدەبژێرن، هەروا بەسەرپێیی پرۆسەکە وەرنەگرن، چونکە دوارۆژی خۆیان و منداڵیانی پێوە بەندە، خاڵێکی تر ئاسوودەیی خێزان دەبێتە مایەی بنیادنانی تاکی تەندروست، بۆیە هەموو ئەوانەی رۆڵیان لە نێو خێزان هەیە پێویستە رۆڵەکەیان بەم ئاراستەیە تەواو ببێتەوە، کێشەکان وئەو گیروگرفتانەی تووشی هەر خێزانێک ببێت پێویستە بە شێوازی رێک و دروست چارەیان بۆ دابنرێت، تەنانەت رێگە نەدرێت منداڵەکان پەی پێ ببەن، تەنها ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندیدار بێت بە خودی منداڵەکان، چونکە لەوانەیە دەبێتە هۆی نانەوەی کێشەی دەروونیی بۆ ئەو منداڵانە، دواتریش کە کێشەیەک پەیوەندی بە کەسێکەوە نەبێت پرسیار لەوەیە بۆچی ئەو کەسە پێی بزانێت، گەر دایک وباوکیش لە خەمی منداڵەکانیان بن چۆن دەبێ رێگە بەخۆیان بدەن کە خودی خۆیان ببنە مایەی ئازار بۆ منداڵەکانیان.



**کابرایەك چووبوو شەمعەی بکڕی لەو کاتە کە گەیشتە دوکانەکەی ناوی شەمعەی لە بیر چوبۆوە، ناچار گۆتیە کابرای برام توخوا مەترەك گلۆپمان بدێ.**

# بۆچی کەناڵەبینراوەکان کوشتار زیاد دەکەن؟

**غازی عبدالرحمن**

دیارە ئەمرۆ تەلەفزیۆن وەک ئامرازێکی پەیوەندی جەماوەری، بەهۆی کاریگەرییەکەی بەشێک لە ژیانی تاک و خێزان و کۆمەڵگە وەکو تاکێکی خێزان بگرە زیاتریش، وەک ئەوە وابێ بە بێ بوونی ژیان سەخڵەت بێت، کات بەسەربردنیش زەحمەت بێت، بێگومان ئەو ئامێرە وەکو هەر دروستکراوێکی دیکە بۆ مرۆڤ دوو سەرەیە، بۆیە لێرەدا تیشک دەخەمە سەر لایەنی باشی و خراپی ئەو ئامێرە کە تەلەفزیۆنە، بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان و نەوەکانمان بە باشترین شێوە سوود لێ وەربگرین و لە زیانەکانی بەدوور بکەوینەوە، بۆیە ئەو ئامێرە زۆر جێگەی بایەخە، چونکە هەردوو هەستی بیستن و بینینی تێدا بەکاردێت و بینەر ئەوەندە ماندوو نابێت بە بەراورد لە گەڵ خوێندنەوە.

خاسییەتێکی دیکەی ئەوەیە کە هیچ کاتێک بۆ مرۆڤ ناهێڵێتەوە بۆ بیرکردنەوەو سوود وەرگرتن لە توانا شاراوەکانی خۆی کە لەم ئامێرە دەستی ناکەوێت، بۆ نمونە لەبیرمە ئەو ساڵانەی کە لە هەرێمەکەماندا کارەبا شەوانە دەبڕا لەو کاتەدا خێزان دەکەوتە بارێکی وەبیرکەوتنەوە، وەک ئەوەی بیر لە داهاتو و رابردووە خۆش و ناخۆشەکان، بەمەش سودمەندبوون لە ئەزموونەکانی رابردوو و بیرکردنەوەو پلان دانان بۆ داهاتو رووی ئەدا، هەر ئەم هۆکارەش وای کردووە کە کاتمان نەبێت بۆ سەردانی کردن و بەسەرکردنەوەی خزم و ناسیاوەکان، خوێندنەوەی پەرتوک و بەدوای زانست گەڕان و ...هتد.

گەر زیاتر قوڵبینەوە لەو جۆرە فیلمانەی کە پیشان ئەدرێت، ناوەرۆکیان بریتییە لە تۆڵە سەندنەوە و کوشتنی ئەو کەسانەی کە تاوانێکیان ئەنجام داوە، واتا چارەسەرکردنی شەر بە شەر، هیچ کاتێک لە یەکێک لە فیلمەکان نەمان بینیوە بکوژێک نەکوژرێتەوەو یەکێک ببێتە هۆی رێنیشاندانی و تاوانبار ببێتە کەسێکی چاکەکار و واز بهێنێت لەم تاوانە، لێرەدا بینەر کاتێک تاوانێک دەبینێت لە دەروونی حەز دەکات کۆتایی تاوانەکە بزانێت، کە بە کوشتنەوەی تاوانبار کۆتایی دێت، لە هەر دوو باردا بینەر تاوانی کوشتنی لا خۆشەویست و جوان دەکرێت، جگە لەمەش دڵ تەنگییەک لای بینەر دروست دەبێت و چەندین هۆرمۆنی هاندانی جەستەیی دەردەدرێت بێ ئەوەی بینەر ئاگای لەوە بێت کە جەستە ئەم هۆرمۆنانە دەردەدات، بینەر وەکو کەسێک وایە کە لە ناو رووداوەکە بێت، بەمەش ئەو هۆرمۆنانەی کە دەردەدرێت بە نەرێنی کاردەکاتە سەر جەستەی بینەر و دواتریش تووشبوون بە زۆر لەو نەخۆشیانەی کە ناوبراون بە نەخۆشیە دەروونییە جەستەییەکان، واتا ئەو نەخۆشیە جەستەییانەی کە دەروون هۆکارەکەیەتی.

لە فیلمە تۆقێنەرەکان (أفلام الرعب) کە رووداوی تۆقێنەر پیشان دەدات، ترس دەبەستێتەوە بە هەموو شتێک، ئەمەش هەستێکی ترسنۆکی دروست دەکات لای بینەر، ئەم بینەرە مرۆڤێکی ترسنۆکی لێ دروست دەبێت لە هەموو دەوروبەری، ئینجا ترس لە مردوو و شەوو بوکۆکەو دار و بەرد و دوکەڵ و هەموو جۆرە گیانەوەرێک و...هتد، بە شێوەیەک هیچ شتێک نەماوە کە فیلمی تۆقێنەری لە دەربارەیەوە دەرنەهێنن، کاتێک مرۆڤ ترسنۆک بوو ئەوا توانای داهێنانی نامێنیت، فێڵکردنیش یەکێکە لەناوەرۆکەکانی زۆربەی فیلمەکان، واش پیشانی بینەر دەدرێت وەک ئەوەی رەوشتێکی باش بێت، بۆ نمونە پیاوێکی هەژار بۆ خۆ تێرکردن فێڵ لە کەسێک بکات و تیکە نانێکی لێ بسەنێت، رکابەرایەتیش بەشێکی تری زۆربەی فیلمەکانە، رکابەریەتیەکانیش زۆرجار لەسەر شتی خراپ دەبێت، وەک لێخوڕینی ئۆتۆمبیل بە خێراییەکی یەکجار زۆر و تێک و پێک دانی شار و کەل و پەلەکانی دەوروبەر، تۆڵەسەندنەوەش بابەتێکی تری فیلمەکانە، کەسێک کە تاوانێکی کردبێت لە فیلمەکان تەنها وەڵامی تاوانەکەی لای تاوان لێکراو بە هەمان تاوان و زیاتریش وەڵام دەدرێتەوە.

خیانەتی خێزانیش لە بابەتە هەرە باوەکانی تەلەفزیۆنە و بە خۆشەویستیش ناوزەد کراوە، لەم بابەتەدا ئافرەتێک دەبینی لەیەک کاتدا چاوبازی لەگەڵ چەند پیاوێک دەکات و پیاوێکیش چاوبازی لەگەڵ چەند ئافرەتێک دەکات، منداڵیان دەبێت و نازانن ئەم منداڵە هی کێیە، بێگومان کاریگەری ئەو جۆرە نیشاندراوانە سەدا سەدیش نەبێت خوی خراپی لێدەکەوێتەوە، پیاوێک یان ئافرەتێکی بینەر لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەرچەندە لەوانەیە کەم جار ئەوە رووبدات لەگەڵ چەند رەگەزێکی تر پەیوەندی هەبێت، بەڵام ئەوەی سەدا سەد روودەدات ئەوەیە پیاو و ئافرەت بەم جۆرە فیلمانە چاو لەدەر دەبێت یان نارازی دەبێت بە هاوسەرەکەی خۆیی و دواتریش ناکۆکی دروست بوون و لەم نێوانەش لە بەین چوونی منداڵەکان لە هەموو رووێکەوە.

دزیکردنیش بابەتێکی تری تەلەفزیۆنە، داخیش ئەوەیە کاتێک ئەم نمایشانە نیشان دەدرێن وا نیشان دەدرێن کە کارێکی چاکە، بۆ نمونە لە هەندێ فیلمەکاندا خێزانێکی بێ دەرامەت لە بارێکی نالەبار بەهۆی دزییەوە چارەی ئەم بارەیان کردووە، ئەمە خۆی لە خۆیدا جوانکردنی دزیکردنە، بێگومان لەوانەیە لە کۆمەڵگەی ئێمە ئەو جۆرە دزییە نەبێ یان کەم بێت، بەڵام ئەم جۆرە فیلمانە هەستێک دروست دەکات لای بینەر کە حەز بە دەولەمەندییەکی زۆر بکات، ئەوەی کە لەو جۆرە فیلمانە نیشان دەدرێت لە واقیع زۆر جار بوونی ئەسەتەمە، دەی کاکی بینەر کە حەزی بە دەوڵمەندبوونێکی کت و پر کرد و ئەو نەستەی کە لای دروست بووە وای لێ دەکات کە هەوڵ بدات بۆ کۆکردنەوەی سەرمایەکی زۆر لە کاتێکی کەم، ئەمەش لە سەر حیسابی هەستی هاریکاری و بەرێکی کارکردن و خیانەت نەکردن دەبێت.

بابەتێکی تری سەرەکی فیلمەکان بریتیە لە سێکس، مرۆڤ بە هەردوو رەگەزیەوە نێر بێت یان مێیە، دروستکراوێکە لەم بوونەدا بۆ کارێکی پیرۆز، مرۆڤ بوونەوەرێکی مەزن و گەورەیە بەرامبەر هەموو بونەوەرەکانی تر، بەڵام لەهەمان کات لاوازیشە بەرامبەر بەدیهێنەرەکەی، بۆ نموونە هەندێک جار بەکتریایەک دەبێتە هۆی لە ناو بردنی، ئەوەی



خۆشی دەهێنێت لەش و لاری مێیەی مرۆڤ یان نێرەی مرۆڤ نییە، بەڵکو خۆشبەختی بە هۆی رەوشتی مرۆڤەکانەوە بەدی دێت، بەلام ئەوەی بەدی دەکرێت لە فیلمەکان لەشی مرۆڤ ئینجا نێرە بێت یان مێیە مایەی خۆشبەختییە بۆ رەگەزی بەرامبەر، ئەم بابەتە ئەوەندە گەورەکراوە بەرادەیەک کە زۆر دوورە لە واقیع و راستی، گومان لەوەدا نییە هەر گەل و کۆمەڵێک ئەگەر بە هیچ هێزێک نەشکێن بە سێکس شکاون، ئەمەش لە حاڵی میللەتی خۆمان بەدی دەکرێت و لە سەرەتاکەیەتی.

خەیاڵیش بابەتێکی تری فیلمەکانە، بەداخەوە مرۆڤ لە راستی دووردەکاتەوە، وا دەکات بینەر کەسێکی خەیاڵی لێ دروست ببێت و توانای هەنگاونانی نامێنێت بۆ ئەو توانا شاراوانەی کە هەیەتی، بینەر کەسێکی لێ دەردەچێت کە باوەر بە شتە بێ ماناکان دەکات، هەندێک جاریش بینەر هەستێکی بێ باوەری بۆ دروست دەبێت بەرامبەر ئەو واقیعەی کە تیایدا دەژی، وا هەست دەکات وەک ئەوەی لە خەونێکدا بێت.



بابەتێکی تری تەلەفزیۆن نیشاندانی بابەتە دۆکیۆمێنتەکان، لەم بابەتەش گیانەوەران و زیندەوەران بە رووێکی ناشیرن پیشانی بینەر دەدرێت، بۆ نمونە شێر وەکو درندەو تاوانبار دادەنرێت، لە لایەکی تر مامز بە تاوانلێکراو نیشان دەدرێ، یان تیمساح و مار و دووپشک و..هتد بە تاوانبار لە قەڵەم دەدرێ، زۆر کەم لەم جۆرە دۆکیومێنتانە دەبینین باسی سوودی شێر یان گورگ یان مار یان بەکتریا یان تیمساح بکات، لە یەکێک لە سیسەتەمەکانی ژینگەیی خەڵکی ئەو ناوچەیە داوایان لە بەرپرسانی ناوچەکە کرد کە گورگ لەم شوێنە بنە بر بکەن، چونکە مەر و مالاتیان دەخوات، لایەنی دەسەلاتدار هەستا بە بنبرکردنی گورگ، پاش ماوەیەک بینیان رووەک خۆرەکان زۆر لە زیادبوونن، وەکو جورج و قرتێنەرەکانی تر، پەلاماری کشتوکاڵی خەڵکەکەیان دەدا، ناچار خەڵکی ئەم ناوچەیە داوایان لە بەرپرسان کرد کە گورگ بهێننەوە ناوچەکە، لێرەدا ئەو گورگە ناونراوە بە تاوانبار ئیشی رێکخستنی هاوسەنگی ناوچەکەیە، بەهەمان شێوە هەر گیانەوەرێک رۆڵێکی هەیە لە سیستەمی ژینگەیی، بۆ نمونە مار و دووپشک و سیسرکە و بەکتریا و ..... هتد زۆر جار دەرمانی لێ دەردەهێنرێت، کەواتە ئەو زیندەوەرەی کە بە ناشیرین و تاوانبار پیشان دەدرێت رۆڵێکی گەورەی هەیە و بە نەبوونی ژیان هاوسەنگی تێک دەچێت.

بابەتێکی تری تەلەفزیۆن ئەویش بریتییە لە گۆرانی، بەهەمان شێوەی فیلمەکان نیشاندانی لایەنی جەستەیی ئافرەت بە شێوەیەک کە زۆر لە خۆی گەورەتر پیشان دەدرێت، بێ گوێدانە لایەنە رەوشتی و دەروونی و دایکایەتی و خوشکایەتی و هاوسەری کردنی ئافرەت بۆ پیاو، بۆچی لە زۆربەی گۆرانییەکان باسی لەش و لاری ئافرەت دەکرێت، بۆچی باس لە سۆزی دایکێک ناکرێت بۆ کۆرپەکانی ئەگەر هەشبێت زۆر بەکەمی، بۆچی گۆرانییەکان باس لە پاڵپشتی کردنی ئافرەتێک ناکات بۆ پیاوەکەی، بۆ باسی تێکۆشان و ماندوو بوون و ئەو ئەرکە زۆرەی لە سەرشانی ئافرەت هەیە ناکرێت، بۆچی باسی رەوشتی جوانی ئافرەت ناکرێت، کاتێک باسی لەش و لاری ئافرەت دەکرێت ئەوا باس لە شتێک دەکرێت کە تایبەتە بە خودی ئافرەتەکە کە ئەمەش تاوانە دەرحەق بە ئافرەت.

بابەتێکی تری تەلەفزیۆن ئەویش فیلمەکارتۆنییەکانە، بەداخەوە تەلەفزیۆن بۆ منداڵ بووەتە باوک بەلام باوکێکی خراپ، بۆ نمونە فیلمە کارتۆنییەکانی مشک و پشیلە، چەندەها ساڵە ئەم مشک و پشیلەیە کێشەی نێوانیان تەواو نەبووە بە جۆرێک لە گەڵ یەک دەجەنگن کە لە هیچ مێژوویەک مرۆڤەکان ئاوا لەگەڵ یەک نەجەنگاون، چ جۆرێک لە کوشتن و برین بە هزری بکوژێک دادێت مشک و پشیلە ئەوە لەگەڵ یەکتر دەکەن، چ جۆرە خیانەت و فێڵ و ناپاکییەک بە هزر و مێشکی تاوانبارێک دادێت مشک و پشیلە ئەوە لەگەڵ یەکتر دەکەن، داخۆ لە پشت ئەم مەسەلەیە چ ئامانجێکی گڵاو هەیە؟ بێگومان هەیە، ئەویش تێکدانی رەوشتی منداڵێکی بێ تاوان بۆ کەسێکی فێڵباز و بکوژ و دڵرەق و ....هتد، بۆ بە دەگمەن مشک و پشیلە هاورا دەبن ئەگەر بشی کەن ئەوا لە دژی سەگ یان خاوەن ماڵ دەبێ.

لە بری ئەوانەی باسمانکرد دەکرێ تەلەفزیۆنەکان پێچەوانەی ئەمانەی سەرەوە کار بکەن و کە ئەنجامەکەی بە تەواوەتی پێچەوانە دەبێت، کەئەمەش لە تەلەفزیۆنەکان پیشان دەدرێت، بەلام بە برێکی زۆر کەم، بۆ نمونە بوونی بەشێک بۆ هاندانی بینەر بۆ گرنگیدان بە خوێندن و نیشاندانی راپۆرتی زانستی بەمەش زانیاری مرۆڤەکان زیاتر دەبێت، بوونی بەرنامەی تەندروستی بۆ تەندروست کردنی لاشەی تاکی کۆمەڵگا، گرنگی زۆر دان بە شتی پێکەنیناوی بەمەش خەم و خەفەتەکان کەم دەبێتەوە، پیشاندانی پێشکەوتن و لایەنە چاکەکانی وڵاتەکان و هاندانی تاک بۆ خۆش ویستنی وڵات و خەڵکان، گرنگی دان بە یاساکانی دەوڵەت بۆ کەم کردنەوەی سەرپێچییەکان، وەکو باس کردنی یاساکان هاتوچۆ، بوونی تەلەفزیۆن لە قوتابخانە بۆ پتەوکردنی لایەنی زانستی قوتابی، گرنگیدان بە زمان و بوونی بەرنامەی تایبەت بۆ خۆشەویست کردنی خاک و نیشتمان لای تاکی کۆمەڵگا، بۆ بەرنامەی تایبەت بۆ بەرەو پێش بردنی رۆشنبیری تاک، بوونی بەرنامەیەکی رۆشنبیری سێکسی، بۆ ئەوەی تاکی منداڵ یان هەرزەکار ئەم بابەتە بە قەبارەی خۆی وەربگرێت و ئەم کۆئەندامەش لە نەخۆش کەوتن بپارێزێت.

وا پێویست دەکات دایک و باوک لە گەڵ منداڵ سەیری بابەتەکان بکەن، ئەگەر بابەتەکە دوور بوو لە واقیع بۆی روون بکاتەوە کە ئەمە فیلمە و راستی نییە، راڤەکردنی ئەوەی منداڵ سەیری دەکات بەمەش بابەتەکە زیاتر منداڵ تێیدەگات و زیاتر سوودی لێ وەدەگیرێت، کرینی ئەو فیلمانەی کە بە سوودن بۆ گەورەو بچوک، گرنگ ئەوەیە بزانین خۆ قەدەغەکردن لە تەمەشاکردنی تەلەفزیۆن کارێکی راست نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بزانین مامەڵەی چۆن لە گەڵ بکەین و تەمەشای چ بە شێکی ئەم تەلەفزیۆنە بکەین، پێویستە بزانین منداڵ تەماشای چی دەکات و گفتوگۆ لە گەڵی بۆ ئەوەی ئەگەر باش بوو منداڵەکە سوودی زیاتر لێ وەربگرێت و ئەگەر خراپیش بوو لێی دووربکەوێتەوە، دانەنانی تەلەفزیۆن لە ژووری نووستنی منداڵ، هەوڵدان بۆ تەماشانەکردنی تەلەفزیۆن هەفتەیەک لە لایەن خێزان بۆ ئەوەی بزانین دەتونرێت دایک و باوک جێگەی تەلەفزیۆن بگرنەوە، کوژاندنەوەی تەلەفزیۆن لەکاتی سەیرنەکردنی چونکە ئەو تیشکانەی لە تەلەفزیۆن دەردەچێت زیان بە تەندروستی دەگەیەنێت.

# پلان سەرت دەخات



سیروان عەلی

ئێمەی مرۆڤ ئەگەر بێتو بە وردی سەیرێکی دەوروبەرمان بکەین دەبینین ئەوەی چاومان دەکەوێتە سەری لەم گۆی زەوییەدا هەر هەمووی بە نەخشەیەکی یەکجار رێکوپێک کارەکانی خۆی رادەپەڕێنێت، لە ژیانی بەکتریایەک کە بە چاوی ئاسایی نابینرێت تا دەگاتە خۆر و مانگ و زەوی و گەلە ئەستێرەکانیش کە لە هەژمار نایەت، وردەکارییەکەش لە ئاستێکی ئەوتۆیە کە بە بڕی گەردێک لەو نەخشەی بۆی هەیە لانادا، بەلام لەنێو ئەم بوونەدا تەنها هەندێ مرۆڤە کە ئەوەی لای گرنگ نەبێت دانانی نەخشەیە لە ژیانی رۆژانەی چ جای نەخشەی درێژخایەن و مام ناوەندی لە ژیاندا ئەمانەی دواتر هەر بیری لێناکرێتەوە.

ئەگەر بێتو هەموو چرکەساتەکانی ژیانمان شی بکەینەوە ئەوا خۆمان لەنێو جەنجالی گیروگرفتەکان ناناسینەوە! وەک لایەنی تەندروستی، ئایا ئێمە تا چەند پەیوەستین بە خواردنی ئەو بابەتانەی کە لەشی مرۆڤ پێویستییەتی، یان هەر خواردنێک لە چ کاتێکدا بخورێت و چەندیشی لێ بخورێت و بە چ شێوەیەک بیخۆیت، من بە هۆی کارەکەمەوە لەو شوێنەی کاردەکەم، زۆرجار پرسیار لە کڕیار دەکەم ئایا تا چەند لەگەڵ شیر پەیوەندیت هەیە؟ وەلامیان ئەوەیە کە: دوژمنم شیرە! یان دەپرسم ئاخۆ گۆشتی ماسی دەخۆیت؟ زۆربەی خەڵکەکە دەڵێن ئەگەر ساڵێ یەک جار بیخۆم ئەگەر نا هەندێکی دەڵێن قێزم لە بۆنەکەی دەبێتەوە! ئەمە لە لایەنی تەندروستی، کە ئێمڕۆ هەزاران کەس بە دەست نەخۆشی درێژخایەن دەناڵێنن، ئەویش لە ئەنجامی نەبوونی بەرنامەیەک بۆ خواردن و خواردنەوە.

ئەگەر لایەنێکی تر وەربگرین ئەویش چۆنییەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ ژینگەدا دەبینین زۆربەمان بۆ مەبەستی قازانجی ماددی و کەسیی دەبینە مایەی زیان گەیاندن بە کۆمەڵە کەسێک وەکو ئەو کارگانەی کە لە چوار دەوری شار هەن، کە لە رۆژگاری ئێمرۆ کەوتوونەتە نێو ئاوەدانی شارەکان، لە دوای ئەو فراوانییە زۆرەی شارەکانی گرتۆتەوە، بەبێ ئەوەی خاوەن کارگەکان لەخۆیان بپرسن ئایا ئەو قازانجە ماددیەی بەدەستی دێنن، لە رێگەی ئەو کارگە زۆرانەی باسمان کرد و دەبنە هۆکار بۆ چەندین نەخۆشی ترسناک لە ئەنجامی دەرهاوێشتەو پاشماوە کیمیاوییەکانی کارگەکانیان ئایا قازانجەکە گرنگترە یان خودی هاونیشتیمانییانی؟ ئەوەی باسیان دەکەم ژمارەیەک لە کارگەی دیارن بەلام نازانم بۆچی ناگوازرێنەوە ناوچە دوور لە شارەکان؟

لایەنێکی تر کە پێویستی بە ئاماژە پێکردنە و دەبێ زۆر بە زویی و بە شێوەیەکی زانستییانە نەخشەی بۆ دابڕێژرێت، مەسەلەی هاتووچۆ و ئەوەی پەیوەندی بەوەوە هەیە، وەکو سیستەمی هاتووچۆ و رێکخستنی تەرخانکردنی رێگەکان بۆ جۆری ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر و ئۆتۆمبێلی بچووک، لەلایەکی تر رێگەگرتن لەو کەسانەی بەبێ مۆڵەت ئۆتۆمبێل لێدەخوڕن، چونکە ژمارەی ئەو خەڵکەی بەهۆی ئەو کەموکوڕییانە گیان لە دەست دەدەن لە زیاد بوونە، بێگومان لایەنی پەیوەندیدار و لە هەمان کات ئێمەی هاوڵاتیش ئەرکمانە بەخۆداچوونەوە بکەین.

**رۆژێك کابرایەك دەچێت تەقویم بكڕێت، دەڵێتە ساحێب دوكانەكەی توخوا تەقویمەكم بدێ عوتلەی زۆر تێدابێ.**

# بەربەستەکانی بەردەم پێکهێنانی هاوسەرگیریی

دایکی محمد

لەم ساڵانەی رابردوودا تاکو ئێستا دیاردەیەکی سەیر لەناو کۆمەڵگەی ئێمە پەرەی سەندووە بەتایبەت لەناو کچانمان ئەویش دیاردەی مارەیی کە بۆتە هۆی رەنگ زەردی و دارمانی ناخی گەنجەکانمان. هەموومان دەزانین کچ دەبێ شو بکا و کوریش ژن بێنێ، بەڵام ئەو خووەی کە ئێستا کچانمان پێیان گرتووە وا دەکات کە کورانمان بیر لە ژن هێنان و پێکهێنانی خێزان نەکەنەوە، چونکە خێزانەکانمان یاخود کچەکانمان هەر لە سەرەتاوە شەرتی یەکەمی دەبێ کورەکە جوان بێت و دووەم دەبێ خاوەن خانوو بێ و سێیەم دەبێت سەیارەی هەبێت و سەرەرای ئەو غەمانەش دەبێ چل تا پەنجا مسقاڵ زێری بۆ بکرێ! ئەوە لەلایەک ئینجا دەبێ تاخمی ماڵی بەتەواوی بۆ بکرێ جگە لەو مەسرەفەی هەتا دەیگوازێتەوە!

ئەو دیاردەیە بۆتە هۆی مانەوەی چەندەها کچ و کورانمان، کە ئەوانیش وەکو گەنجەکانی تر حەز دەکەن خێزان پێک بێنن، لێرەدا دەڵێین ئەوە تاوانی خێزانەکانمانە یان دیاردەیەکی بیانییە هاتۆتە ناو خێزانەکانمان، بۆتە خاڵێک لە هۆکارەکانی دارمانی کۆمەڵگەکەمان؟ لەوەڵامدا دەڵێین بەڵێ ئەمە دیاردەیەکی بیانیە هێناویەتیانە ناو خێزانەکانی ئێمە، بەڵام لێرەدا ئەگەر بمانەوێ ئەو دیاردەیە راست بکەینەوە ئەوە دەبێ روو لە دایک و باوکی ئەو کچانەمان بکەین کە بوونەتە هۆی مانەوەی گەنجەکان تا تەمەنێکی دیاری نەکراو و کچەکانیان کردۆتە سوتەمەنی حەز و ئارەزووی خۆیان، ئەوەش بۆتە هۆی مانەوەی چەندەها گەنج لە کۆمەڵگەکەمان. لێرەدا دەڵێین دایک و باوکی ئازیز بۆ بەچاوێکی تر سەیری ئەو بابەتە ناکەن؟ لە بری پارە و زێر و خانوو، ئەگەر هاتوو بە چاوی ماددە سەیری ئەم بابەتە نەکەین رۆژانێکی پرشنگدار چاوەروانی گەنجەکانمان دەکات.

بێگومان دایک وباکیش سۆزدارترین و خەمخۆرترین کەسی رۆڵەکانیانن، بۆیە چاوڕێی هەڵوێست و کاری بنیادنانیان لێ دەکرێت، نەک ببنە مایەی مانەوەی جگەرسۆزەکانیان، ئەوکات دایک بڵێت بریا وام نەکردبا و باوک خۆزگە بخوازێ بەم جۆرە نەدەبووم! بەبێ ئەوەی ئەم پەشیمانییە سودی هەبێ.



## دەم و چاوێکی بە پێکەنین باخچەیەکە لە ناوەڕاستی زستاندا

خوناو شێروانی

زۆرجار گورانی وتن یاخود نوکتە وتن رەنگدانەوەی ئازارەکانی دەروونە بۆ کەمکردنەوەی غەم و ئازارە پەنای بۆ دەبا مرۆڤ، زۆرجاریش دەگاتە رادەیەک کە بگری و پەنا بۆ فرمێسک دەبات و دەیکاتە هۆیەک بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانی و سۆزی بە هۆی بابەتی کردنییەوە لە شێوازی توندوتیژییەکەی، ئەم حاڵەتەش لای ئێمە زۆرجار دووبارە دەبێتەوە کە تووشی ئازارێک دەبێت هەوڵ دەدەین ئازار کەم کەینەوە بە هۆی پەنابردن بۆ کارێکی هونەری قەرەباڵغی و گەشاوە، پێویستە لە سەر مرۆڤ ئاشنایەتی کەسە کراوەکان بن، چونکە رووێکی خۆش و دڵێکی بێ گەردیان هەیە و دوورن لە خەمۆکی، ئایا کێ بێت لە ئێمە مانای تەنگ و چەڵەمەو خەفەتی رۆژگار کۆسپ و مەینەتی پەنجەی نەخستۆتە قورگی چەندان ئاوات و خەونەکانمان؟ ئێمە لاوی خوێن گەرمین و پاشەرۆژ چاوی لێمانە، دەتوانین بە چەندان کۆسپ ریگەی ژیان تەخت بکەین، خاوەن بازووی پتەوین ئەم گیروگرفتانە شتێکی کاتیە تەنها رق و کینە هەنگاو قورس دەکات، پێویستیمان بە هێمنی هەیە، هەندێک لە زانایانی سایکۆلۆژی پێکەنین بە هۆیەک دادەنێن بۆ کەمکردنەوەی خەم و ئازار و حاڵەتێکی زۆر بە نرخیشە، چونکە پێکەنین کلیلی کردنەوەی خۆشی و رووناکییە لەسەر روو، جا ئێمەش هەردەم دەم بە خەندە و قسەی نەستەق و رووخۆش بین، چونکە رووخۆشی سیفەتی خۆشەویستە، بۆیە ئێمە دەبێ رووخۆش بین لەگەڵ ژیان.



# تێگەیشتن

سازان رزگار

وتەیەک هەیە دەڵێت: ئەگەر بزانیت کەوا نازانیت ئەوە بەلایە، خۆ ئەگەر نەزانی کەوا نازانێت، بەلایەکە گەورەترە، بێگومان کاردانەوەی کەسەکانیش بەرامبەر ئەم حاڵەتە دەبێتە چەند جۆرێک یان ئەوەتا نازانێت کاتێکیش کە زانی نازانێت ئەوکات هەست بە پێویستی کۆکردنەوەی زانیاری دەکات بۆ هاوسەنگ کردنەوەی بارودۆخەکە، ئەوکاتیش لاربوونەوە کە ئاسایی دەبێت و لە نەزانییەکە دێتەدەر، واتە درککردن بەم حاڵەتی کەم شارەزاییە و کەمی زانیارییە بنەمایەکە بۆ هەنگاو هەڵێنان بۆ گەیشتن بە ئاستی باشتر و هاندەرێکە بۆ هەوڵی زیاتر و هۆشیار بوون و زانست کۆکردنەوە، بەڵام ئەوەی بەلاکە قورستر دەکات و قوڕەکەش تیرتر دەکات ئەوا ئەگەر کەسەکە نەزانێت کەوا نازانێت، چونکە لێرەدا ئەو جۆرە کەسانە هەست بە پێویستی هەوڵدان بۆ زانیاری زیاتر ناکەن، ئەوکاتیش ئاستی وەک خۆی دەمێنێت، جا بە بەراورد لەگەڵ دەوروبەرەکەی ئەوا لە دواکەوتن دا دەبێت، چونکە رەوتی بەرامبەرەکەی لە بەرەو پێشچوون دایە.

ئەوەی دەمەوێت ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە خەڵکێکی زۆر لەبەشی دووەم چەقی خواردووە، واتە هەست بە بارودۆخ و ئاست و تواناکانی خۆی ناکات، چجای هەوڵی بەرەو پێشچوونی، ئەم جۆرە کەسانەش ئەگەر بیاندوێنی ئەوا خۆیان وا دەبینن کەوا لە هەموو کەس زاناتر و داناترن، هەر ئەمەشە کە لە گێژاوی نەزانییان دەهێڵێتەوە، واتە گیروگرفتەکە لێرەیە کە تێنەگا لە حاڵی خۆی کە چەندە پەشێوە.

بۆیە تێڕوانین و بۆچوونی کەسەکان بە درێژایی تەمەنیان رۆڵ و کاریگەریی هەیە لەسەر هەڵوێستەکانی، بۆیە پێگەیاندنی تاکەکان بۆ ئاستی داواکراو لە شارەزایی بۆ ئەوەی نەڵێت گەیشتۆتە ئاستێک کە ئیتر پێویستی بەوە نەماوە کە هەوڵی بەدەستهێنانی زانیاری بدات، چونکە وەک دەڵێن تۆ زانای تا ئەوکاتەی دەڵێی پێویستیم بە وەرگرتنی زانیاری ماوە، هەرکاتێک گوتت پێویستیم پێی نەماوە ئەوکاتی گەیشتیتە پلەی نەزانی، چونکە هەموو کۆششەکانی لەم بوارە رادەگرێت، بەمەش لە پێشکەوتن دەوەستێت.

**ژنێك گوتیە پیاوەكەی خۆزگە وەكو ملوانكە دەبووی تا هەردەم لە ملم بوایە، پیاوەكەش گوتی: خۆزگە ژن وەكو بیتاقەی بایەعی بایە تا هەموو ساڵێك نووم بكردبایەوە.**

# ژیان لە گەڕەکە میللییەکاندا!

جەمال بیلال

هەموومان دەزانین کە ئینسان لە هەرجێگایەک نیشتە جێ بوو ئەوە دەبێت هاوسێشی هەبێت، ئەمە شتێکی سرووشتیە، بەڵام ئەوەی من دەمەوێ لێرە باسی بکەم گیروگرفتی ئەم هاوسێیەتیەیە کەوا رۆژانە بە هەزارەها گیرو گرفت دروست دەبیت لەسەر شتێکی زۆرکەم و بێ بایەخ، بەتایبەتی لەگەڕەکە میللییەکاندا، بەداخەوە وادیارە ئاستی رۆشنبیرییان نزمە، لەوانەیە زۆربەمان گوێبیست بووینە کەوا چەندین جار لەسەر شتێکی کەم شەڕی گەورە دروست بووە، بەو هۆیەوە چەند کەس کوژراوە و بریندار بووە.

دەمەوێ ئاماژە بە هەندێک لەوگیروگرفتانە بکەم کەبەندە خۆم لەناوی دەژیم وەکو واقیع، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەنەکردنی منداڵ لە لایەن خێزانەکەی بە شێوەیەکی زانستی و رێک و پێک، ئەمەش وای کردووە کە ئەم منداڵە بەردەوام کێشە دروست بکات لە دەرەوەو لە ماڵەوە، بۆیە خانەوادەی منداڵ زۆر جار ئەم منداڵە رەوانەی دەرەوە دەکەن و دەبێتە هۆی بێزارکردنی هاوسێ و خەڵکی گەڕەک، ئەم جۆرە منداڵەش بەردەوام شەڕانگێز و بێزارکەر و جنێوفرۆش و ...هتد دەبێت.

یەکێک لەم روداوانە ئەوەبوو جارێکیان منداڵی یەکێک لە دراوسێیەکانم پاش شەڕە شەق و توپێن کردن لە سەر شەقام و ناو چڵکاو هاتوهاوارکردن و تۆپ فڕێدانە ماڵەکان و هەراسانکردنی هاوسێکان و شەڕکردن و ئەزیەتدانی منداڵی تر، لێرە دەپرسم کاکە گیان ئەم بێزارکردنە لەو کاتە ناوەختییە بۆچی؟ بێگومان کاکی جیران بە هەموو هەوەسییەوە دەڵێ: خۆ منداڵەکانم بەند ناکەم، لێرە بۆمان روون دەبێتەوە کە کاکی دراوسێ پەروەردەکردنی منداڵ لە ژێر کۆنترۆڵی دەرچووەو منداڵەکانی بۆ خۆ رزگارکردن رەوانەی دەرەوەیان دەکات! داخۆ ئەم کۆڵانە چەند منداڵی لەم جۆرەی تێدابێت.

# شێواندنی چەمکەکان

گ.ر

کێشەی چەمکەکان لەلای خەڵکی بۆتە بابەتێکی زۆر رون و ئاشکرا، رونتر مەبەستم ئەوەیە چەمکەکان مانایان گۆڕاون و بەڕاددەیەک مەسەلەکە ئاڵۆز بووە دەکرێت چەمکێک پێناسەکانی بەقەد ژمارەی خەڵکەکە بێت، پێشتر دەمانخوێندەوە پێناسەی فەلسەفە بەقەد ژمارەی فەیلەسوفەکان پێناسەی بۆ کراوە! بەڵام ئێستا لەوە دەچێت خەڵکی هەمووی خۆی بە فەیلەسوفێک بزانێت، هەربۆیە خەڵکی هەمووی و هەریەکە پێناسەی خۆی هەیە بۆ شتەکان، لێرەدا ئەم مامەڵەکردنە مەترسییەکەی لەوەدایە شتە نەگۆڕەکان پایەیان نەمێنێت، چونکە تاکە کەسەکان ئەگەر ئەو مافەیان دا بەخۆیان هەریەکەو پێناسەی تایبەتی هەبێت بۆ شتەکان ئەوا خاڵەکانی جیاوازی لە ژمار نایەن، ئەو کاتیش گونجان و یەکریزی دەبێتە شتێکی نامۆ و مەحاڵ.

ئەوەی جاران هەڵە بوو دەکرێت لەم رۆژگارە زۆر راست بێت، ئەوەی پێشتر شورەیی بوو دەکرێت ئەمڕۆ جێی شانازی بێت، ئەوەی پێشتر جێی سەرشۆڕی بوو دەکرێت لەم ساتەدا جێگەی سەربەرزی بێت یان هەرلەبنچینەدا سەربەرزی نەمێنێت! ئەوەی پێشتر سیفەتی شێتەکان بوو ئێستا خەڵکی هەموو بیکەن و ببێتە مۆدە، وەک بەر ماوەیەک خەڵک عەیب بوو بە جلی دڕاوە بچێتە دەرەوە ئێستا کچیش پانتۆڵەکەی دڕاوە و مۆدێلە! یان خەڵکی پێشتر ئەو پرچەی بەسەریەوە بوو بەلایەک شانەی دەکرد و بەوە جیا دەکرایەوە لەگەڵ شێت، کەچی ئێستا گەنجان بەشی هەرە زۆری شانەکردنی پرچیان هەر تاڵێکی بۆ لایەک چووە و ئەمە بۆتە نیشانەی جوانی و رێکی و...تد.

کارەکە گەیشتۆتە پلەیەک کە بەجۆرێک پێویست بکات سەرلەنوێ فەرهەنگێکی نوێ بنوسرێتەوە کە تیایدا وشەکان پێناسە بکرێنەوە، سەرلەنوێ سیفەتی شێتەکان دیار بکرێتەوە، سیفەتی پیاوانە دیاریبکرێتەوە، سیفەتی ژنانە دیاریبکرێتەوە، کە ئاواش کرا چ پیرۆزییەک دەمێنێت؟ بێگومان دەبێ سیفەتی باو و باپیرانیشمان دیاریبکرێتەوە کە ئەوانیش چی بوون؟ ئایا ئەوان هەڵە بوون یان دواکەوتوو!

لێرەدا ئەوەی خۆی دەخاتە پێشەوە ئایا کێ دەتوانێت ئەو کارە بە ئەرکی خۆی دابنێت و پێی هەڵسێت؟ باشە ئەگەر ئەوە کرا دەبێت شتەکان هەمووی ئاوەژوو ببێتەوە بۆ نموونە ناوی خۆش لەخۆمان نەنێین با هەریەکە چۆن سیمایەک دیاری دەکات بۆ خۆی بەگوێرەی ئەوەوە ئەو ناوە لەخۆی بنێت، بەڵام ئەوکات فەرمانگەکانی ناسنامە دەبێ دابخرێن، چونکە ناتوانێت هەر رۆژەی تەنها بۆ یەک کەس زیاتر لە ناوێک تۆمار بکات، ئەوکاتە لە توانای ئەوان دەچێتە دەرەوە، ئێمەش ئەگەر ناوی یەکێکمان لە مۆبایلەکەمان تۆمار کرد و پەیوەندیمان پێوەکرد و ناویمان برد یەکسەر وەڵام دەداتەوە ببورە من ئەو کەسە نیم کە تۆ دەتەوێت، ئەو کارە بۆ ئەوە باشە خەڵکی خزم و کەسە نزیکەکانی بناسێتەوە! ئەگەر نا کێشەیەکی دەروونی کە لەوانەیە پەرەبسەنێت ببێتە کێشەیەکی عەقلی گەورە بۆ خەڵکی کە چەمکەکان مانای راستی خۆیان لەدەست دەدەن، چونکە ئەو کات عەقل بڕ ناکات چ هەڵوێستێک بگرێتە بەر.



رۆژێك مامۆستا لە قوتابیەك دەپرسی ١+١ دەکاتە چەند؟ قوتابیەکە دەڵێ: دەکاتە(٣) نەو جارە مامۆستا دەڵێ: کورم ١ دار و ١ دار دەکاتە چەند؟ قوتابیەکە دەڵێ: دەکاتە سێ دار. مامۆستا زۆر تورە دەبێت دەڵێ: کورم باوکت چ ئیش دەکا؟ قوتابیەکە دەڵێ: مطعم ی هەیە. زۆر باشە شیشەك کەباب و شیشەك کەباب دەکاتە چەند؟ قوتابیەکە دەڵێ: دەکاتە نیو نەفەر.

# گفتوگۆی خودی بۆ چارەی کێشەکان



**خانزاد رەزا**

لـەبـەردەم ئاوێنەکە وەسـتـابـوو، ئاوێنەکە ڕاستگۆیانە وێنەی دەرەوەی پیشان دەدا لە شێوەو روخسار و ڕەنگی قژو چاوو پێست و درێژی باڵا..تد، بە ئاوێنەکەی گوت: خۆزگە لە توانات دا هەبایە ناخی دڵی مرۆڤەکانیش پیشان بدەی!

ماڵێکی هەبوو لەگەڵ هاوسەرەکەی ژیانی تیایدا دەژیان، کاتێک هەستی بە لاوازی کردبا دەبوو بە باوک بۆی، کاتێک دەگریا دەبو بە دایک بۆی، کاتێکیش هەڵەی دەکرد دەبوو بە خوشک بۆی، کاتێک پێویستی بە ئامۆژگاری بوایە دەبوو بە براگەورە بۆی، کاتێک هەستی بە دڵتەنگی و نیگەرانی بکردبا دەبـوو بە خۆشەویستی و هەردەم لەگەڵی بو و هەرگیز جێی نـەدەهێشت، خێزانەکەشی ئـەوی بە هەموو کەسی خۆی دائەنا، لە یەکێک لەگەڕەکە ئاساییەکانی شار لە خانووێکی سادە دەژیان، لـە باخچەی خـانـووەکـەدا جۆلـلانـەیـەک بۆ دانیشتنی ئێوارانی هاوینان و لەنێو هۆڵەکەش دا پیانۆیەک بۆ شەوانی درێژی زستان هەبوو، ژورێکی میوان بۆ پێشوازی کردنی میوانانی هەردولایان، ئۆتۆمبیلێکی ناوەندیان هەبوو بۆ هاتوچۆی دەوام و ئیش و کاری رۆژانەیان گونـجاوبوو، جارجـارە دەمـەقـاڵـیـان دەبـوو لەسەر ئەوەی کە کامیان ئەوی تریان زیاتر خۆش دەوێ؟! بەردەوام لە کێبڕکێ دابوون، لەپڕ لەخەو ڕاچەنی! هەستایەوە سەرپێ و چووە بەرامبەر هەمان ئەو ئاوێنەیەو لەگەڵ خۆی کەوتە گفتوگۆ: چۆن ئەم خەونە بکەمە ڕاسـتـی؟! دنیایەک کۆسپم لـەبـەردەمـە، من تـازە خوێندنم تـەواو کـردووە، پاش ئەوەی کە دانـەمـەزرام، بڕیارم دا لە کۆمپانیایەکی ئەهلی بەیانی تا ئێوارە کار بکەم، مووچەکەم چەند سەد دۆلارێکە و نیوەی موچەکەم بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ و هاتوچۆی ڕێگایە، هـەرچـەند خـۆم مـاندوو بکەم نـاتـوانـم ئەم خەونەم بێنمە دی، چونکە کێشەمان زۆرن بۆنمونە کێشەی هاتووچۆ، کاتێک بەیانیان بۆدەوام دەچم ئەگەر تەکسی نەگرم بەهیچ پـاس و کۆستەرێک ناتوانم بچمە شوێنی دەوامەکەم، سەیر دەکەم زۆربەی سیارەکان یەک یان دوو کەسی تیایەو قەرەباڵغیەکی زۆری دروسـت کـردووە، ئـێواران کـە لە کار دەگەڕایەوە هەوڵی ئەدا چیرۆکی پیاوە مـەزنـەکـان بخوێنێتەوە وەلـێ شـەکـەتی و هیلاکی کـار بـواری نــەدەدا، حـەزی دەکـرد وەرزش بکات بـەڵام هەمدیس نەیدەتوانی، کەمێک داما، پاشان تلیفۆنی بۆ هاوڕێیەکی نزیکی خۆی کرد و پاش سـڵاو کـردن پێی گوت کەوا خەونێکی وای بینیوە، لەوەڵام دا هاوڕێکەی پێکەنی و گوتی: ئەوەی تۆ باسی دەکـەی ڕێک پێچەوانەکەی ڕاسـتـە، سەری سوڕماو پرسی: بۆچی ؟! خانوی خۆت هەیە و ئۆتۆمبیلی خۆت هەیە و لەخوا بەزیاد بێ هەردوکتان خۆت و خێزانت موچەتان هەیە، هاوڕێکەی ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی: ئەوانەی تۆ باسیان دەکەی هەمووی ڕاستن و ڕۆڵیان هەیە لە کەمکردنەوەی کێشەکان بەڵام خۆشی ژیان و دوورکەوتنەوە لە کێشە، بەتەواوەتی نەبەستراوەتەوە بە هەبوونی سامان بەڵکو پەیوەستە بە عەقلیەت و جۆری بیرکردنەوەی کەسەکانەوە.

ڕووی لە ئاوێنەکە کـردەوەو بەخۆی گوت: خواکەریمە، ئەی ئەگەر وانەبوایە خەڵک چۆن دەژیـا، بـەو مووچە کەمەی ساڵانی پێشوو کە مامۆستایەک مانگانە نزیکەی دووسـەد دیناری هەبوو کەچی گوڵلەی RBG بە پێنج سەد دینار بوو، بەڵام خۆزگە بەڕێوەبەرانی وڵات بەڕێژەیەک کەریم بوونایە کە بژێوی خەڵک باشتر ببوایە، هەموو کەسێک لە ژیانی دا چەند هەلێکی بۆ دەڕەخسێ پێویستە بە باشی بیقۆزێتەوە.

## بەرپرسیارەتی

**سەمیر حوسێن**

ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم ویژدانی زۆرێک لەو کەسانەیە کە ئیشی کرین و فرۆشتنی ئۆتۆمبێل دەکەن، هەر گرفتێکی هەبێت یان کەموکوڕییەکی هەبێت دێن لەلای فیتەر چاکی دەکەنەوە، بەڵام ئایا ئەوان دەیانەوێ چۆن بۆیان چاک بکرێتەوە؟ ئەوە پرسیارێکی زۆر گرنگە، ئەمرۆ کەلوپەلی ئۆتۆمبێل دوو جۆری هەیە کە بریتییە لە جۆری باش و جۆری خراپ، ئەو کەسەی کە ئۆتۆمبێلەکەی چاک دەکاتەوە دەیەوێت بە کەمترین پارە بۆی چاک بکر ێتەوە، هەر بۆیە پەنا دەباتە بەر کەل و پەلی خراپ، بێگومان بەکارهێنانی ئەو کەل وپەلە خراپانە دوای ماوەیەکی کەم بەرەو تێکچوون دەچێت، کە تێکچوو زیانەکانی ڕاستەوخۆ لە هەر کات و شوێنێک بێت ڕوودەدات، بەڵام ئایا وەستا بۆ بەو جۆرە چاککردنەوە خۆی دەخاتە بەردەم بەرپرسیارەتی، چونکە ئەگەر ئەو تێکچوونە لە کاتی ڕۆیشتن بوو؟ ئەوا ژیانی شوفێرەکە و ئەو کەسانەی کە لە ناو ئۆتۆمبێلی ترن دەکەوێتە مەترسی بە هۆی ئەو کەل و پەلە خراپەی کە بۆ ئۆتۆمبێلەکەی بە کاری هێناوە ئەویش چونکە لەبیری ئەوە نەبوو ئایا ئەو کارەی دەیکات چەند ڕاستە، بێگومان لە پێناو چەند پارەیەکی کەمی بۆ دەگەڕێتەوە، بەڵام چەندین زیانی گیانی و مادی هەیە، ئەگەر بێتو ئەو کەسە ئۆتۆمبێلەکەی بە کەلوپەلە باشەکان چاک بکاتەوە کە پارەیەکی کەمی جیاوازە لەگەڵ خراپەکان، ئەوکات ئەو پارە کەمە دەبێتە هۆی پاراستنی گیانی خۆی و کەسانی تریش.

# کێشەی دوژمنداری

**شاگوڵ گەلاڵی**

هەروەک دەزانیین هەرکۆمەڵگەو نەتەوەیەک دابونەریتی تایبەت بەخۆیان هەیە، کە بەهۆیەوە لە کۆمەڵگاکانی تر جیادەکرێنەوە، وەک باوە دەگوترێت زووربەی دابونەریتەکان رەسەنایەتی نەتەوەکان بەدیاردەخەن، بەڵام ئایا ئەم بۆچوونە تا چ رادەدیەک راستە، ئەگەر یەکێک لەو دابونەریتە باوانەی لەناو کۆمەڵگەی کوردەواری خۆماندا بە نموونە وەربگرین، دواتر بەراوردی بکەین لەگەڵ بەها مرۆڤایەتیەکان، بۆمان بەدیاردەکەوێ کە ئێمە خاوەنی چەندەها دابونەریتی چەوتین و خەڵکیش بەگشتی پێیوەی دەناڵێنێ، ئەویش دیاردەی دوژمنداریییە.

چەندینجار گوێبیستی ئەوەبووینە کە یەکێک لە خانەوادەیەک کوژراوە هەر زوو بێ لێکۆڵینەوە و بۆ تۆڵەسەندنەوە برا یاخود ئامۆزا یان هەریەکێک کە دوور و نزیک هیچ پەیوەندییەکی بە رووداوەکەوە نییە لە خانەوادەی بکوژەکە کوژراوە و بکوژەکەش لەشوێنێکی نادیار خۆی ونکردوە، دواتریش زۆر بەخێرایی ماڵی باوک و مام و ئامۆزاکانی هەردوولا بۆ شوێنی نادیار هەڵدێن و ماڵەکانیان چۆڵ دەکەن، تا لەکۆتاییدا یان بەهۆی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و ریش سپی و پاوماقوڵان واز لە یەکتر دەهێنن یانیش هەر لەباری ترس و دژبەیەک دەژین و ئاشت نابنەوە و کوژراوی تری لێدەکەوێتەوە و ئەم دوو بنەماڵەیە هەرگیز خۆشی لەژیان نابینن.

بێگومان ئەم دابونەریتە ناکەوێتە ژێرباری هیچ پێوەرێکی مرۆڤایەتی، بۆیە حەیفە بگوترێ دابونەریت رەسەنایەتی میللەتانە، چونکە کۆمەڵگەی ئێمەش وەک بەشێک لە گرۆی ئادەمی خاوەنی چەندین هەڵوێستی مەردانە بووە لە کۆن و ئێستاش کەچی ئەم جۆرە دووژمنداریە لەکوێوە فێر بووە؟ کە بۆتە دابونەریتێکی نادروست و نرخی مرۆڤایەتی لەکەدار دەکات و نەتەوەیەکیش ناوزەڕ دەکات. دەپرسین ئەگەر یەکێک لە ئێمە هەڵەیەکمان ئەنجامدا تیایدا مافێک پێشێلکرا، ئاخۆ چەند رێگەچارە هەیە بۆ وەرگرتنەوەی ئەم مافە؟ بێگومان کوشتن نەک هەر رێگە چارە نییە بەڵکو بارودۆخەکە ئاڵۆزتر دەکات و مافەکان زیاتر پێشێل دەکات، چونکە سەرەتای هەردوژمندارییەک لە هەڵەیەک یاخود لە یەکتر نەگەیشتنێک دەستپێدەکات. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر بەها بەنرخەکان و رەسەنایەتی مرۆڤ ئەوا دەبینین پڕیەتی لە ئارامگرتن و لێبوردەیی و رێزگرتن و خۆشەویستی و یارمەتیدان و دەم بەخەندە و ژیانێکی پڕ ئاسوودە کە رێک پێچەوانەی تۆڵەسەندەوە و گرژی و توندوتیژی و شەڕانگێزیە کە دەبنە مایەی ژیانێکی پڕ کێشە و ناخۆش.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە ناتوانیین پەنا بەرین بۆ یاسا و شەرع تا مافە زەوتکراوەکرانمان وەربگرینەوە، بەڵکو دەڵێین با هەموومان بەردەوام زاڵبین بەسەر ناخی خۆمان تا هەردەم دووربین لە لەبڕیاری هەڵە کاتێک یەکێک مافمان زەوت دەکات، ئەگەر کارگەیشتە ئەو ئاستەی بیر لە تۆڵەسەندنەوە بکرێتەوە، ئەوا دەرگای دادگا و پۆلیسخانەکان کراوەن تاوەکو بەپێی یاسا مامەڵە لەگەڵ رووداوەکەدا بکەن. ئاشکرایە داگیرسانی دەنکە شقارتەیەک ئاگرێکی زۆر بچووکە دەتوانین بە فوی منداڵێکی بچووکیش بیکوژێنینەوە کە هیچ کەسێک تیایدا زەرەرمەند نابێن، بەڵام لەهەمان کاتدا دەتواندرێ گەورەترین ئاگری لێبکەوێتەوە و هەم ماڵی خۆمان و هەم ماڵی خەڵکیش وێرانبکەین، مرۆڤی هۆشمەند هەر ئاگر ناکاتەوە نەک گەورەی بکات، چونکە هەردەم زاڵە بەسەر هەڵچوونەکانی و بیر لە لەناوبردن ناکاتەوە، بەڵکو هەردەم تواناکانی خۆی بۆ بونیادنان و خزمەتکردنی خەڵک دەخاتەگەڕ.

# مۆدێل چاومانی کوێرکرد

**باوکی سیما**

هەموومان دەزانین کە ئێمەی مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەمان گەلێک پێداویستی هەیە زۆر پێویستمان پێیەتی وەک خواردن و خواردنەوەو خەوتن و کارکردن، لەگەڵ ئەم هەموو پێداویستیانە کە ئێمەی مرۆڤ چ رەگەزی نێر یان رەگەزی مێ پێویستیمان بە چەند شتێکی زۆر گرنگ هەیە ئەویش جلوبەرگە، هەموومان دەزانین هەموو گەل و هۆزێک جلوبەرگی تایبەتی خۆی هەیە کە گوزارشت لە نەتەوەی خۆی دەکا ئێمەی کوردیش نەتەوەیەکین وەکو هەموو نەتەوەکان کە جلوبەرگی تایبەتی خۆمان هەیە، کە گوزارشت لە نەتەوەی کورد بکات، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ دەبینین جلوبەرگی کوردی وەکو خۆی نەماوە، تەنانەت ئەو جلانەی کە لەبەریشی دەکەین نازانین چۆن بۆمان ئامادەکراوەو وە چ مەبەستێکی لە دواوەیە، مەبەستم جلوبەرگی ئافرەتانە، ئەوەی من ئاگاداربم وەکو بازرگانێک ئافرەت چ کچ یان ژن ئەگەر بێتو راستگۆیانە بێنە قسەکردن لەگەڵ ناخی خۆیان دەبینین بەو جلوبەرگە هیچ مورتاح نین، بەڵام چاوی مۆدێل کوێر بێت وای کردیە کە ئەو جلوبەرگانەی وەختی خۆی بە دوو درهەم نەیان دەکڕی ئێستا لەبەر ئەوەی مۆدێلە بە (١٠٠) سەد دۆلار دەیکرن، زۆر بەئاسانی لەبەریشی دەکەن، بەڵام ئەگەر پرسیارێک لەناخی خۆیان بکەن بەراستگۆیانە وەڵامی بدەنەوە دڵخۆش نین بەو جلوبەرگە لەبەر ئەوەی پێچەوانەی ئەوەیە کەبۆیان دانراوە، من دەمەوێ پرسیارێک لەکچان بکەم ئایا هیچ کاتێک بیریان لەو دیزاینە کردۆتەوە کە ئەو جلوبەرگانەی لەسەر دادەرێژرێت؟ و بیریان لەوە کردۆتەوە کە کێ ئەو دیزاینانە بۆ جلوبەرگەکانیان دادەرێژن؟ لە وەڵام رێژەیەکی زۆر پیاوان دیزاین بۆ جلوبەرگی ئافرەتان دادەرێژن، کە خۆیان چۆن پێیان خۆش بێت دایدەرێژن، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو دیزاینە شەهوەتی تێروانینی سێکسیانەی خۆیان پێ تێربکەن، بەداخەوە دەڵێم رەگەزی مێینەیان کردۆتە بوکەڵە شوشە چۆن بیانەوێ ئاوا دیزاین بۆ جلوبەرگەکان دادەرێژن، خۆزگە بیرێکمان لەو جلوبەرگانەی خۆمان دەکردەوە کە چی لەبەردەکەین و و چۆن لەبەری دەکەین، دەبا ئافرەتان خۆیان جیا کەنەوە لەپیاوان بە جلوبەرگی جوانی ئافرەتان، وەک چۆن بولبول بەڕەنگ ودەنگە خۆشەکەی خۆی جیاکردۆتەوە لە هەموو باڵندەکانی تر.

# فارگۆنەکانی ژیان

رابەر رزگار



گەنجێکی سوورو سپی قژ زەرد و چاوشین لە گەنجێکی ئەسمەری سەر رەشی چاو قاوەیی پرسی:

- خەون و ئاواتت چییە؟

- لە وەڵام دا وتی: حەزدەکەم بتوانم خێزان دروست بکەم و شوێنێکی نیشتەجێبوونم هەبێت مووچەیەکی ئەوتۆشم هەبێت یان ئیشێک کە بتوانم ماڵی پێ ببەم بەڕێوە، بتوانم بە ئارامی و بێ ترس بژیم.

- ببورە من وتم خەونت چییە، نەم وت مافەکانت چین!

هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی هەریەکێک لەوانەی سەرەوە کێشەیەکە بۆخۆی، بەدەستهێنانیان بۆ هەندێک ئەستەمەو بۆ هێندێکی تریش لە ئاسان ئاسانترە، کێشەیەک کە ئاراستەی هەڵسو کەوتی مرۆڤەکان بەرەو گرژی ببات پێویستی بە چارەیە.

زۆرینەی دانیشتوانی کۆمەڵگەی ئێمە چاویان لە دەوڵەمەندی و سامان کۆکردنەوەیە، تا ئێرە مافی خۆیەتی وەلێ زیادەرۆیی کردن بە مالی دنیا جێگای نیگەرانییە، لەکاتێکدا کەسانێک هەن تەنانەت پێداویستییە سەرەتایی و بنەڕەتیەکانیشیان دەستەبەرنەکردووە، لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە هەبوونی چارەسەر بێت بەڵکو لەوانەیە توێشووی زۆر لە خراپەکاریەکان بێت، بەڵام هەرچۆنێک بێت مافی هەبوونی پێداویستییەکانمان هەیە.

کێشەی کرێچییەتی تەنگی بە زۆرێک هەڵچنیوە لەبەرامبەردا کەسانێک هەن بەداهاتی کرێ دەژین و دەوڵەمەند دەبن، کەسێک بتوانێ نرخی ژمارەی ئۆتۆمبیلەکەی یەکسان یان زۆر نزیک بێ لە نرخی ئۆتومبێلی هەژارێک و ژمارەی مۆبایلەکەیی و سیم کارتەکەی زیاد لەپێویست نرخدار بێت و هەر هەمان مەبەستیش مەیسەر بکات چۆن دەتوانێ بەخۆی بڵێ کەوا زیادەڕۆییم نەکردووە؟ پێداویستیەکان بەگوێرەی سەردەم و بارودۆخ دا دەگۆڕێن، جاران کەم ماڵ هەبوو تەلەفۆنی هەبێ ئێستا زۆربەی هەرە زۆری مۆبایلی تایبەت بە خۆی هەیەو بگرە هەمانە دووان و سیانمان هەیە، جاران کەم ماڵ هەبوو ئوتومبێلی هەبێ، ئێستا بە مۆدێلی٣- ٤ ساڵ لەمەوبەر ئەڵێن مۆدیل کەون، لەخانووێکدا سێ خێزان و چوار خێزان دەژیان ئێستا کەم کەس هەیە کە پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدات لەگەڵ ماڵە باوک دا بیگوزەرێنێت، بە بەراورد لەگەڵ ساڵانی پێشوو بارودۆخ ئێستا زۆر باشترە، بەڵام خۆ ئەوکاتیش هەر مافی خۆمان بووە پێداویستیەکانی ژیانمان فەراهەم بێت و بە باشی بژین، وەنەبێ ئێستا کەموکوڕی نەبێ بەڵکو چاوپۆشیمان کردووە لە زۆر شت، لە وڵاتی ئێمەدا خوانەکا کەسێک تووشی نەخۆشییەکی سەخت بێت یان تووشی کارەساتێکی ئۆتۆمبێل بێت لەو شەقامە نارێکانەی نێوان شارەکان! ئیتر تەرازووی دارایی خانەوادەیەک تێک دەچێت، چونکە هیچ گەرەنتییەکی تەندروستی، ئۆتومبیل ...تد نییە، زۆرجار گوێبیست دەبین کە کەسێک بە ئۆتومبیل لە منداڵێک یان پیرێکی دا بەهۆی نەبوونی شوێنی پەڕینەوەی گونجاو یا بەهەر هۆیەکی تر، ئیتر مەگەر خاوەنی خوێن خاوەن ویژدان و ناخێکی پاک بێت ئەگینا بەهەوەسی خۆی وەک بازاری ئازاد نرخ لەسەر خوێنەکەی دادەنێت، لەو کاتەشدا یاسا مۆڵەتی وەرگرتووە!

**لە شەمەندەفەرێکی هندستان کە لە سێ فارگۆن پێکهاتبوو**
**یەکەم بۆ پیاو ماقووڵان، دووەم بۆ مامناوەندییەکان، سێیەم بۆ هەژاران بوو.**
**لەکاتی پشکنیندا، دەبینن (غاندی) سواری فارگۆنی هەژارەکان بووە لێی دەپرسن بۆ لێرە سوار بوویت؟**
**غاندیش گوتی: چی بکەم، فارگۆنی چوارەمی نەبوو!**

# گەورەترین کێشە لە جیهاندا

د. مظهر صابر شێخە*

شەوێکیان تا نیوەی شەو بەدیار ئینتەرنێتەوە دانیشتم گوتم بزانم گەورەترین کێشە لەم جیهانەدا کە خەڵک تا ئێستا بۆی چارەسەر نەکراوە چییە؟ دوای گەڕانێکی زۆر بە دوای وشەی گەورەترین کێشە، ناخۆشترین، خراپترین، تێکدەرترین، قورسترین، بێ چارەسەرترین....تد. ئیدی ئەم وشانەم لە چەندین زمان و زاراوەی جیهاندا بەکارهێنا، بزانم خەڵک بە دەست چییەوە دەناڵێنن؟ خەم و خەفەتی خەڵک چییە؟ خەڵک بەدوای چیدا دەگەڕێ؟ بۆچی هەوڵ دەدات؟ زۆر سەرسام بووم و حەپەسام بۆچی مرۆڤ ئەوها بیر دەکاتەوە، ئەگەر دەریاکان بکەینە مەرەکەب و ئارەزوو و پێداویستیەکانی مرۆڤ بنووسین ئەوە بە درێژای مێژوو کۆتایی نایەت و هەر بەدوای زیاتریشەوەیە داوای زیاتریش دەکات. هەر لەکاتی گەڕانەکە هەندێک بە لایانەوە گەورەترین کێشە ئەوەبوو شەڕو ئاژاوە هەندێک برسییەتی هەندێکی تر رامیاری، ئەمانە چەندین کێشەی ترن کە خەڵک پێوەی دەناڵن وەک نەخۆشیەکانی جەستەیی و دەروونی بە هەموو جۆرەکان، کێشە کۆمەڵایەتییەکان وەک توڕەبوون و تەڵاق.. تد، کێشەی ڤایرۆس لە کۆمپیوتەری داوە و ئینتەرنێتەکەی کار ناکات، یان داونلۆدەکەی خاوە و یارییەکان ئەتاری نازانی ئیشی پێ بکات و چۆن و پاسۆردی لەبیر کردووە و بازرگانییەکەی سەرکەوتوو نەبووە و بۆڕی ئاوەڕۆکەی گیراوە و تایەی ئۆتۆمبێلەکەی تەقیوە و یاهو ماسێنجەرەکەی ئیش ناکات و مێردەکەی لەگەڵی باش نییە، خواردنی خواردنگەی ناخۆش بوو، کاسبی نەبوو و فایلەکەی سەیڤ نەکردبوو و منداڵەکەی نانی ناخوات ئیدی بڕۆ تا ١٠١٠٠٠٠٠٠ ملیۆن پەیجی گوگڵ هەرپەیجێکیش ١٠ دانە کێشەی هەیە ئەوە بەس نووسینی (أكبر مشكلة في العالم) لە سێرچی گوگڵ جا بڕۆ بۆ سەر زمان و وشەی تر، بۆیە سەیرم هات کە مرۆڤ ئەو هەموو خەم و پەژارەیەی هەیە. باشە ئێستا لەم هەموو گێژاوە مرۆڤ چی بکات ئایا دەبێت مرۆڤ بێت یەک بەیەک کێشەکان چارەسەر بکات، کە ئەمەش زۆر مەحاڵە بتوانێت چارە بۆ هەموو کێشەکانی دونیا دابنێ یان ئەوەتا دەبێت یەک چارەسەر بۆ هەموو کێشەکان هەبێت! با هەموومان بەیەکەوە بگەڕێین و بیربکەینەوە بزانین دەگەینە هیچ ئامانجێک و وەڵامێک؟ بەڵام من وەکو تاکێک وا هەست دەکەم تەنها ئامراز بۆ ئەوەی بگەینە راستیەکان ئەویش ئامێری بینین و بیستن و بیرکردنەوەیە کە دەبێتە هۆی گۆڕانی تێڕوانینی مرۆڤەکان بۆ کێشەکان و گێروگرفتەکان و راستیەکانی رۆشنبوونەوەی رێگە بۆ گەیشتن بە لوتکەی خۆشی و ئارامی و خۆشبەختی.

ئەگەرنا مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی بیرکردنەوەی دەوروبەری خۆی هەرجارە و لەگەڵ بای لایەک دەجولێ، ئاگاشی لە خۆی نابێت کە بەرەو چ ئاقارێک دەڕوات، ئیدی نەک گیروگرفتی بێ هەژمارە رووی تێدەکەن، لە ناو گێژەلۆکەکان غەرق دەبیت و ژیانی راستەقینە لەدەست دەدات و ون دەبێت.

*زانکۆی سەلاحەددین



**شێتێکیان بردبووە فەحسی چاوی، چاوی شەش بوو لەسەر شەش بوو هاتبووە دەرێ دەیگوت دکتۆر لێی تێکدام دەنا زیاترم دەهێنا.**

# لەهەر یەکێکیان چەند وانەیەک وەربگرە

* مامۆستایەک بەقوتابییەک دەڵێ: وێنەی فنجانێکی قاوە بکێشە، ئەویش دەڵێ: شیرین یان تاڵ.

* لەکەسێکی ڕەزیل ئەپرسن زەحمەت نەبێ کاتژمێر چەندە؟ ئەویش دەڵێ: خۆ بۆتۆم نەکڕیوە.

* قومارچییەک دەڵێ: بەختەکەم ئەوهایە ڕۆژێک ئەیبەمەوەو ڕۆژێک ئەیدۆڕێنم، یەکێک لەولاوە دەڵێ: کەواتە ڕۆژ نا ڕۆژێک بیکە.

* بەکەسێکی دەوڵەمەند دەڵێن سەرەڕای ئەو هەموو خانوانەت، لە کرێ نیشتەجێی، دەڵێ: ئاخر بەهەرزانتر بەکرێم گرتووە.

* لێکۆڵەرێک بە تۆمەتبارێک دەڵێ: ت چۆن بەم شەوە چووی بۆ دزی، تۆمەتبار دەڵێ: ئەی قابیلە بەڕۆژ بچم.

* کڕیارێک دەچێتە پەرتوکخانەیەک و دەڵێ: کتێبی (پیاو گەورەی ژنە) تان هەیە، خاوەنی کتێبخانەکە دەڵێ: ببورە ئێمە کتێبی ئەفسانەییمان نییە.

*شەیتان لەدەرگای ماڵی فیرعەونی دا، فیرعەون پرسی کێیە؟ شەیتان گوتی: ئاواش داوای خوایەتی ئەکەی، نازانی لەپشت دەرگاوە کێیە.

* لە کتێب فرۆشێکیان پرسی بازاڕت چۆنە؟ گوتی: زۆر خراپە چونکە پارەدارەکان نەخوێندەوارن، خوێندەوارەکانیش پارەیان نییە.

* مامۆستایەک لەپۆل دا دەپرسێ: چ شوێنێک چڕی دانیشتوانی زۆرە، یەکێک هەڵ ئەستێتەوەو دەڵێ: : ماڵی ئێمە بەخۆم و دایکم و باوکم و خوشک و براکانم و براژنەکانم و منداڵەکانیانەوە ١٥ سەر خێزان لەیەک ژووردا دەژین.



* بەتوڕەییەوە براگەورە بە برابچوکەکەی دەڵێت ئەو ئۆتۆمبیلەت بۆ دزیوە هەرئێستا بەباوکم دەڵێم ڕادەستی پۆلیست بکات، برا بچوک: نەم دزیوە لەبەردەرگای گۆرستانەکە ڕاگیرابوو وام زانی خاوەنەکەی مردووە، منیش هێنامەوە بۆ گەراج.

* منداڵ: نەنە! ئەتوانیت فستق بشکێنی؟ نەنە: نەوەڵا کورم ددانم لەکوێ بوو، منالّ: دەباشە تا دێمەوە ئاگات لەو فستەقانەم بێت.

* دەوڵەمەندێک لای بۆیاخچییەک پێڵاوەکانی بۆیاخ ئەکرد: دەوڵەمەند: برام خەفەت مەخۆ منیش پێشان بۆیاخچی بووم، بۆیاخچی: دڵخۆش مەبە، منیش پێشان دەوڵەمەند بووم.

## پێویستیەکانی بڕوانامە و زانکۆ

سەفین مظفر

لەهەر وڵاتێکی پێشکەوتوو کە زانکۆیەک یان بەشێک دەکرێتەوە بەبێ هیچ زانیاریەک نەکراوەتەوە بەڵکو توێژینەوەیەکی زۆری لە بازاڕی کارو پێداویستیەکانی ئەم وڵاتەدا بۆکراوە، ئاشکرایە لەم هەرێمەی خۆشمان چەندین کۆلێژی ئەهلی کراونتەوە، لێرە پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم کۆلێژانە بەبێ دیراسەکردنی بازاڕی کار کراونەتەوە؟ چونکە خەڵکێکی زۆر هەیە بەهۆکاری کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان کەمی نمرە و دەوڵەمەندی و چەند هۆکارێکی دیکە نەیانتوانیوە بخوێنن، ئێستا لەو کۆلیژە ئەهلییانە دەخوێنن، کە ئەمەش وا دەگەیەنێت کە لەسەر حسابی قازانج کراونەتەوە، ئەمە لۆ خۆی گرفتێکە و تووشی زۆری بڕوانامە دەبینەوە، هەروەها دەبێتە هۆی دواخستنی چارەسازی بۆ گرفتی بێکاری. ئەم دیاردەیە بەس لە هەرێمی خۆشمان نییە بەڵکو لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبیش ئەمە هەیە، کە دوای چەند ساڵی دیکە تووشی ئەو گرفتە دەبینەوە کادیری ناوەندمان نامێنێت وەکو دار تاشی و ئاسنگەری و فیتەر، هەموو پیشە ناوەندییەکان ئەمانە هەمووی بزوێنەری پەرەپێدانی ئابوریین، ئەمەش گرفتێکەو باش نییە تووشی ئەو وڵاتانەو هەرێمەکەمان دەبێتەوە، کە زۆربەی خەڵکان دەبنە خاوەنی بڕوانامەی بەرزو مەعریفەیەکی زۆرە، بەڵام بەو بڕوانامانە ناتوانرێت کەمترین بەرهەم هەبێت، بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوە بکرێت دەربارەی ئەو مەسەلەیە بەرلەوەی کارەکە بە جۆرێک تەشەنە بکات کە هیچ چارەیەک لەگەڵی نەگونجێ.

# چەند پرسیار و وەڵامێک دەربارەی منداڵ



پەروەردە بریتییە لە پێگەیاندن و فێرکردنی منداڵ بەشێوەی پێویست و رەسەنی خۆی، کەواتە ئەوەی پێویستە و لەسودی ئەوەی منداڵەکەیە بکرێت لە مامەڵە و هەڵسوکەوت و قسە و تەنانەت خۆراک پێدانیش دەچێتە بواری پەروەردەکردنی منداڵ.

ئەگەر بپرسین منداڵ لە قۆناغی کۆرپەلەیی شێوەی پەروەردەکردنی چۆنە؟

منداڵ لە قۆناغی کۆرپەلەیی پەروەردەیەکی زۆرباش و پێشکەوتووی هەیە، هەروەک راهێنەرێکی هەبووبێ فێری پەروەردەیەکی جوان و ئامادەی کردووە بۆ دایک وباوک.

شێوەی فێرکردنەکەی: منداڵ لە سەرەتای تەمەنی کۆرپەلەیی بەردەوام پێدەکەنێ و رق و کینەی لە دڵ نییە، بەڵکو نازانێ لە هیچ مرۆڤێک تورەببێ، زۆرپاک و بێگەرد مامەڵە دەکەن، ئەگەر هاتوو کەسێک ئازاری منداڵێک بدات لە جیاتی ئەوەی منداڵەکە رقی لە دڵ هەڵگرێ و لێی زویر ببێت بە پێچەوانەوە منداڵەکە باوەشی بە کەسەکە دەدات کەوا لێیداوە و هیچ قسەیەکی ناشیرین بەو کەسەش ناڵێ.

لێرەدا دەپرسین: کێ ئەو منداڵەی فێری ئەو پەروەردە باشە کردووە؟

لە وڵامدا دەڵێ: ین: ئەو پەروەردە رێک و باشەی کەوا فێری منداڵ کراوە لە تەمەنی کۆرپەلەیی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە منداڵەکەی دروستکردووە.

کە ئەم خاڵەمان زانی پرسیارێکی تر سەرهەڵدەدات ئەویش: کێ دواتر بەرپرسیارە لە گۆڕانکاری کردن لە پەروەردەی ئەو کۆرپەلەیە؟

لە وڵامدا:

١- دایک وباوک بە پلەی یەکەم رۆڵیان هەیە لە گۆڕانکارییەکانی بەسەر سیفەتەکانی ئەو کۆرپەلە دادێت.

٢- قوتابخانە ریزبەندی دووەم وەردەگرێ لەم پرۆسەیەی پەروەردەکردنی ئەو منداڵە.

٣- ژینگەی کۆمەڵایەتی و مەعریفی پلەی سێهەم وەردەگرێ.

بۆیە ئەم سێ خاڵە بەیەکەوە بەندن و هاوشانی یەکتر کاریگەرییان دەبێت لەبەر ئەوە نابێت هیچێک لەمانە فەرامۆش بکرێت، بەڵکو دەبێت بەشێوەیەکی تەندروست و ژیرانە کاریان لەسەر بکرێت ئەگەر بمانەوێت کۆرپەکانمان بە پاک و بێگەردی بمێننەوە.



# کاریگەریی دایک و باوک لەسەر منداڵ



زۆر لە دایک و باوکان منداڵەکانیان فێری وشەی ناشیرین دەکەن و لە کاتی وتنەوەی ئەو وشە ناڕێکانە لە لایەن منداڵەکانەوە بە لار و لەنگییەوە زۆر پێی دڵخۆش دەبن، زیاتر بە منداڵەکەی دووبارە دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی ئەو منداڵە بزانێ مانای وشەکان چین! وردە وردە بە گەورەبوونی تەمەنی منداڵەکە زیاتر پاڵنەری دەبن بۆ (جوێندان). لەپاڵ ئەمەی پێشووش لێدانی منداڵەکە لەلایەن دایک و باوکەوە زیاتر منداڵێکی شەڕانی لێ دەردەچێت، هەروەها لە قوتابخانەش دایکان و باوکان وا دەزانن ناردنی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە فێری رەوشتی بەرزتر و پەروەردەی باشتر دەبن، بەڵام هەمان پەروەردەی دایک و باوکەکە دووبارە دەبێتەوە لە قوتابخانەش زۆر لە مامۆستا بەڕێزەکان وشەی ناشیرین و لێدان لەگەڵ قوتابی بەکاردەهێنن، چاوپۆشیکردن لە قوتابییەکان لە شەڕکردن و وشەی ناشیرین بە یەکتری وا لەم منداڵە دەکەن کە ئەو رەوشتانە خوی پێوە بگرێت و لەسەری رابێن، دەبینین ئەو منداڵەیە کەوا دایک وباوک و قوتابخانەش پێوەی دەناڵێنن و لە دەستی بە ئازارن.

جا لێرەدا چەند خاڵێک دەخەمەڕوو دەربارەی ئەو رێگەیانەی کە پێویستە بەکاربهێنرێن بۆ پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر پەروەردەی رەسەنایەتی خۆی بمێنێتەوە:

١- بەکارنەهێنانی وشەی ناشیرین بەرامبەر منداڵ.

٢- هان نەدرێت و فێری شەڕکردن نەکرێت، بۆ نمونە بەکار نەهێنانی فیلمەکانی جەنگ و پۆلیسی و فیلمە کارتۆنییەکانی ململانێ و نا پەروەردەیی.

٣- پێویستە دایک وباوکان و قوتابخانەش منداڵەکان بە جۆرێکی ئەوتۆ بگرنە خۆیان کە منداڵەکە فێری هێمنی و خۆڕاگری بێت.

٤- (گەشت کردن) زۆر جار پێویستە بۆ منداڵ تاوەکو جوانی بوونەوەر بزانێ وەک چۆنییەتی هەڵسوکەوتی باڵندە لەگەڵ یەکتری یان خۆڕاگری دارێک کەوا زیانی پێ دەگەیەنن، بەڵام ئەو دارە ئاسوودەیی بە دەوروبەر دەبەخشێت.

٥- خاڵێکی گرنگ ئەویش لە نێو پەروەردەکردنی منداڵ هەوڵی زۆر بدرێت کە ئاسۆی تێڕوانینی منداڵەکە فراوان بکرێت، چونکە دایکان و باوکان تەنانەت زۆرێک لە مامۆستایان وا دەزانن منداڵ ئامێرێکی بچووک و کەم توانایە، بەڵام ئەگەر بێتوو کار لەسەر فراوانکردنی ئەو ئاسۆیە بکرێت ئەوا منداڵەکەش بە شتی بچووک و زیانبەخش زۆر خەریک نابێت.

## مەزنترینەکان

گەورەترین بەهرە .. منداڵی باشە
گەورەترین دیاری .. لێبوردنە
گەورەترین سەرمایە .. متمانە بە خۆکردنە
گەورەترین نهێنی .. مەرگە
گەورەترین مامۆستا .. ئەزموون و تاقیکردنەوەیە
گەورەترین شانازی .. ئیمانە
گەورەترین گوناه .. ترسە
گەورەترین خۆشگوزەرانی.. کارە
گەورەترین غیرەت و گەورەیی.. خۆڕاگری و هێمنایەتییە
گەورەترین نیعمەتی ژیان .. ئاسایش و ئارامی روحە



# دلنیشتوانی گوندەکانی کوردستان ماستی تورکی دەخۆن!

**مظفر صابر**

پێشتر دێهاتەکانی کوردستان پڕبوون لە بەروبوومی جوتیارانی گوند، خەڵکی کە دەچووە بازاڕ ئەو بەرهەمە جوانەی لە سەوزەو میوە و بەروبوومە ئاژەڵییەکان و پەلەوەریی بەهەموو جۆرەکانییەوە دەست دەکەوت، کە ئەمەش هەرزانییەکی زۆری لە بازاڕ دروست کردبوو، لەلایەکی دی ببوە سەرچاوەی داهات بۆ خەڵکێکی زۆر و دەرفەتی کار بۆ خەڵکی شار و بەهەمان شێوە بۆ خەڵکی گوندەکانیش، لە بەهاری خۆشی کوردستان چوومە سەردانی گوندێک بۆ گۆڕینی هەوای ساف و دیتنی چیا و خۆشی ئەم ناوچەیە، لەم سەفەرە دیتم کە ژیانی ئەوانیش وەکو شارەکانی لێ هاتووە لەبەر سپلیت دانیشتوون و خەریکی واسیتەی دامەزراندن (تەعین) بوون و لە بیری فەلاحەتی نەماون، هەتا پێداویستی رۆژانەی خۆشیان وەکو تەماتەو خیارو سەوزەوات لە شارۆچکەکان دەکڕن! پرسیم ئەدی حەیوان و مەڕو ماڵات بەخێوکردن؟ هیچیان نەمابوو منیش سەرم بەرز کرد دیتم مەڕو ماڵاتێکی زۆری لە سەر چیا! پرسیم ئەدی ئەمە چییە؟ گوتیان: ئەمانە هەموی هی (عارەب)انە، کەواتە ماستەکەش هی خۆمان نەمابوو، منیش خەیاڵ دای گرتم و گەڕامەوە منالیم کە دەچوومە گوندی لە گەر خالۆم، دەچوومەسەر کار کە ئەو خەریکی چاندنی تەماتەو پێداویستی خۆیان بوو،



هەروەها زیاتریان دەچاند بۆ فرۆشتنیان کوا ئێستا گوند وەکو خۆی ماوە، بێگومان لێ ڕاهاتن لەسەر بێکاری و دانیشتن چاوەڕێی موچەی پاسەوانی و بەردەستیی و کاری لەم جۆرە لە گوندەکان ئەو نەخۆشییەی بڵاو کردۆتەوە، بۆیە گرنگی دان بە گوندەکان دەبێ ببێتە ستراتیژییەتی لایەنە پەیوەندیدارەکان، چونکە بارودۆخەکە لەوە دەرچووە بە خەڵکی گوندەکان چارە بکرێت، بێگومان ئەم حاڵەتەی دروست بوو کارێکی گەورەی لەسەر ئابووری وڵات دروست کردووە، گرفتەکە لەوەیە ئەو پەیوەندییەی ئابوورییەی کە گوندو شارەکانی لەیەک گرێ دابوو تا رادەیەکی زۆر لاواز بووە، پێشووتر هەولێر ماستی دەناردە زۆربەی ناوچەکانی عێراق، بەڵام ئێستا ماستێکی لەوجۆرە ئەستەمە لەناو هەولێریش بەدی بکرێت بەو تام وچێژ و بێ خەوشەی جاران! ئەگەر ئەمە گرفت نەبێ ئەی چی گرفت و کارەساتە!

# دیدێکی جیاواز بۆ گۆڕانکاری

**محمد کارزان**

گۆڕانی ناخەکان پەسەندە و زۆر جاریش خۆشەویستە، هەموومان پێویستمان پێیە و هەمووشمان دەمانەوێت، بەڵام چەند کاری بۆ دەکەین و چۆن کاری بۆ دەکەین؟ ئەوەیان شتێکی ترە و جیاوازیمان هەیە، هیوا و ویست بەتەنها لایەنێکە و چەند و چۆنیەتی کارکردن لایەنێکی ترە و رادەی سەرکەوتنمان دیاری دەکات لەو هەنگاوەمان.
بۆ ئەوە پێویستی بە یاساو رێسای تایبەتی هەیە پابەند بوون پێی ئامانجەکانت دەپێکی و گۆڕانەکە بەردەوام دەبێت، بە پێچەوانەشەوە پابەند نەبوون پێی دەستەکەوتەکان کاتین و کۆمەڵێک دەرهاویشتەی خراپ لە دوای خۆی بەجێی دێڵی.
با باسی گۆڕانکاری لە کەسایەتی خۆمان و دەوروبەرمان بکەین، یەکەم شت کە پێوستە بیزانین ئەوە پێویستی بە پلەبەندی هەیە کە بنەمایەکی سەرەکییە لە کرداری گۆڕانکاری، دەکرێت وێنەی بکەیت کاتێک لە تاریکی نیوە شەو راستەوخۆ بچیتە نوێژی نیوەڕۆ تووشی چ حاڵەتێکی دەروونی دەبیت! گۆڕانکارییەکە پلەبەندی تێدا بەدی ناکرێت، کە خۆی بە سپێدە دەست پێدەکات و دەبێتە کازیوە و رۆژهەڵات و چێشتەنگاو نیوەڕۆ و دوای نیوەڕۆ رۆژئاوا و شەو و نیوەشەو بە سەحەر کۆتایی دێت و دووبارە دەبێتەوە. لە هەمان کاتدا ئەو گۆڕانکاریە پێویستی بەکات هەیە کە لە ماوەی ٢٤ کاتژمێر ئەنجام دەدرێت.
کەواتە پلەبەندی و کات دوو بنەمای سەرەکین لە کرداری گۆڕانکاری پێویستە لەبەر چاو بگیرێت و پێچەوانەکەی بریتیە لە کودەتا یەکسەر ئەوەی بتەوێ بێتەجێ و زوو بگەیتە ئامانجەکانت بەڵام دەستکەوتەکانی کاتین و دەرهاویشتە خراپەکانی زۆر زیاترە، هۆکار بۆ ئەم پەلە پەلییە بەرای من ئەوەیە ئەوانە رووداو جوڵەیان پێدەکات و هەر رووداویش ئاڕاستەیان دەکات بۆیە رووداویش دەیان وەستێنێ و کۆتاییان پێ دێنێت. لەبری ئەمە ئەگەر ئامانجەکان رەسەن بان و رەگ و ریشەیان هەبوایە رەچاوی پلەبەندی کات دەکرا و گۆڕانکارییەکان بەرهەمدار و بەردەوام دەبوون.

**جارێکیان کوڕێك دەچێتە داخوازی کچێك پیی دەڵێ: ٢٠ سەیارە بە یەك دەست رادەگرم! کچەکە دەڵێ بۆ رامبۆی؟ دەڵی ناوەاللە مرورم.**



# دیاردەی سواڵکردن بەردەوامە

تەلار صلاح الدین

باسی دیاردەیەک دەکەم کە کۆمەڵگە بە دەستیەوە توشی گرفت دەبێت ئەویش سواڵکردنە، چەند کەسێک و چەند خێزانێک هەیە کە ئەم کارە دەکەن لەماڵان و دوکان و شەقام و شوێنە گشتییەکان دەگەڕێن و دەسوڕێن بۆ ئەوەی لە ڕێگەی سواڵکردنەوە پارە و سامان کۆ بکەنەوە، خەڵکی هەراسان دەکەن بەم کارەیان بەوەی لە سەرەتا داوات لێدەکات کە پارەی پێبدەیت، یان داوای شت دەکات، بۆ نموونە لە زستانان داوای دەبەیەک نەوت دەکەن، یان داوای خواردن دەکات و زۆر دەپاڕێتەوە، دەزانم کەسێک نییە دڵتەنگ نەبێت بە پاڕانەوەی سواڵکەرەکان، چونکە خۆیان زۆر کەم دەکەنەوە! مرۆڤ لە خودی خۆیدا زۆر گەورەیە و نابێ بۆ هیچ شتێک ئەوەندە خۆی نزم بکاتەوە، ئەگەر پارەیان نەدەیتێ ئەوا دەست دەکەن بە جنێودان و قسە پێگوتن و دوعا لێکردن لەو کەسەی کە شتێکی پێنەداوە!

وەک دەبیینین ئەم دیاردەیە مندال و ژن و زەلام پێی هەڵدەستن، زۆرجار هۆکارەکە هەژاری نییە، بەڵکو وەک پیشە ئەنجام دەدرێت، هەرچەندە مرۆڤ هەژاریش بێت نابێ ئەم کارە ئەنجام بدات، چونکە بەم کارە لە هەژاری رزگاری نابێت ئەمە ئەگەر نەیکات بە پیشە! ئەوکات هەردەم لەم کارە نابەجێیە دەمێنێتەوە و فێردەبێت و منداڵەکانیشی بە میرات بۆیان دەمێنێتەوە و خوی پێوە دەگرن، زۆر کات دەبیستینەوە لەپاڵ ئەم دیارە کاری ناشیرین فێر دەبن! وەک دزیکردن و شەڕکردن لەگەڵ خەڵکی و چەندین کار و ڕەفتاری تری خراپ.

جار بووە کچی(١٤) ساڵ و گەنج بە شەوانە لە ترافیکەکان سواڵ دەکەن، بۆیە تا بکرێت هەموومان بە لایەنە پەیوەندیدارەکانیشەوە هەوڵ بدەین ئەم کارە نارێکە نەمێنێت وەک ئەوەی یارمەتی داراییان بدەین ئەگەر هەژار بوون و فێری کار و پیشەی چاکیان بکەین، ئەگەر یارمەتیمان دان، هەر لەسەر سواڵکردن بەردەوام بووون ئەوا ڕێگرییان لێ بکرێت تاکو واز لەم کاری سواڵکردنە بێنن بەهەر شێوەیەک بێت، تاکو دەروونیان خاوێن ببێتەوە و کۆمەڵگەش لەم دیاردە دزێوە پاک ببێتەوە.

**دایکێك لایلایەی بۆ منداڵەکەی دەکرد بۆ ئەوەی بنوێ، منداڵەکە دەڵێتە دایکی ئەرێ دایکە بێدەنگ نابی تا بنووم؟.**

# مرۆڤ دیلی ژیان نییه



عادل محمد

شاعیرێکی فارس دەڵێ: (درین دنیا هیچکس بیغم نباشد، اگرباشدبني ادم نباشد) لەم جیهانەهیچ کەس بێ خەم نییە، ئەگەر هەشبێ ئەوە ئەو کەسە ئادمیزاد نییە.
لەم جیهانە خۆشرەوە کۆمەڵێک جەنجاڵی و ئاڵۆزی بۆ مروڤەکان دێتە پێش هەم لە ڕووی خێزان و هەم لە ڕووی کارو پەیوەندییەکان.. هتد، کەواتە پێش ڕوودانی هەر ئاڵۆزییەک ناحاڵیبوونێک لەیەکتر پێوستە مروڤ گریمانەکانی بۆ خۆی زیاد بکا و پێش هەر ڕووداوێکیان بخوێنێتە و ببێتە شتێکی سادە، ئینجا لە هەرکات و ساتێکدابێت بتوانێت مروڤەکان ریزبەندیی بکات بۆ هەریەکە شێوازێک بە کاربهێنێت لەگەڵیان.
بۆیە دەتوانیت لە شوێنی خۆت چاوێک بگێڕێ بە دەوری خۆتدا تا مرۆڤەکان ریزبەند بکەی لە گیروگرفتەکاندا.
ئەگەر توانییت خۆت وەک کارسازێک بێنە دەر لە ناو بازنەکە وەکو دکتۆرێک هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ گرفتەکان.
لەهەر ئاڵۆزیەکدا کە ڕووبەڕووت دەبێتەوە مەشلەژێ، چونکە هەموو شتێک تێدەپەڕێت و سەرەتا و کۆتایی هەیە، لەپاش یان دوای گرفتەکە تەماشای گرفتەکە بکە چەندە بچووکە.
لەگەڵ گرفتەکان دەبینە هاورێ و ڕۆژانە گوزەر دەکەین و زۆرانبازیان لەگەڵدا دەکەین و بە زەویان دەخەین.
هەرگیزاو هەرگیز نابینە دیلی غەم و گرفتەکانمان.
چونکە وەکو شاعیر دەڵێ هیچ کەس نییە بێ خەم، ئەگەر هەشبێ ئادەمیزاد نییە.
کەواتە ڕۆژانە لە ململانێین لەگەڵ گرفتەکاندا و دەبێ زاڵبین بەسەریاندا تاکو لەگرفتە گەورەکاندا سەرکەوتوو بین، وەکو کورد دەڵێ: سوار هەتا نەپەڕی نابێتە سوار، ماندووبوونی ژیان لەززەتە، گریانیشی هەر لەززەتە، ئەو مرۆڤە دەبێ لە هەموو شت عاقلمەندتر بی، بۆیە خوای گەورە ئەوەندە شتەی بۆ فەراهەم هێناوە هەمووی لە خزمەتی ئەو دایە بۆیە ژیان قوتابخانەیەو..
لەگرفتەکان فێری ئارامی دەبی..
لە گوڵ و گوڵزار فێری بۆن خۆشی دەبی..
لە دارە بە بەرەکان فێری بەخشین دەبی..
لە شەپۆلی دەریاکان فێری هێمنی دەبی..
لە چیاکان فێری خۆڕاگری دەبی..
لە فراوانی ئاسمان فێری دڵفروانی دەبی..
لە بێدەنگی شەو فێری بیرکردنەوە دەبی..
ئەمانە تاکوتایی ئەو هەموو قوتابخانەیە بۆ پێگەیاندنی مرۆڤەکانە تاکو مروڤێکی چاپوکی لێ دەربچی، تاکو مرۆڤێکی بە بڕوا و بەهێزی لێ دەربچێ بەرەنگاری هەموو گرفت و شەڕو ناخۆشیەک بێتەوە کە دێتە ڕێی و زاڵ بێ بەسەریان، هاوار بکە زۆر بەهێمنی بڵێ منم مرۆڤی دەرچووی قوتابخانەی ژیان، ئەو ژیانەی خودا لە پێناوی من فەراهەمی کردووە، لە سەر پەروەردەی ئەو پەروردە کراوم لە باغ و رووبارو مانگ و ڕۆژ و چیا و زەریاکان پەندم وەرگرتووە.
گرفتە دیلی دەستم نەک من دیلی دەستی گرفتم.

**کابرایەك مۆنیكای كڕی نەیدەزانی لێخوڕی هەر ڕۆیی لەناكاو سەیارە ئاگری گرت پێی لێ دەناو هیچ خۆی تێك نەداو گوتی: ئەمرۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە.**

# ئەو ئافرەتەی (٤٠) داری لێدرا

مخلص محمد

ئێمە زۆرجار گوێبیستی ئەوە دەبین کە یەکێ بە ناوی (محمد) یا هەرناوێکی تر ئەمرۆ نەفسی دەرچوو لەو دونیایە نەقل بوو بۆ دونیایەکی تر، جا بە مردنی خۆی بێت یا هەر هۆکارێکی تر تەسلیمی خودا بوو، واتە هەموومان ئەوە دەزانین کە مردن هەیەو (راستیەکی شیرینە) نەک تاڵ، مردن تەنها بۆ مرۆڤیش نەهاتووە، بەڵکو هەرچی بوونی هەیە لەو دونیایە رۆژێ دادێ کۆتایی دێت، هەر وەک ئەو مادده لە قوتوو کراوانەی کە کارگە بەرهەم هێنەرەکان کاتی بەسەر چونیان بۆ دیاری کردوەو لە سەر نووسیوە، ئەوەی لێرە من دەمەوێت باسی بکەم ئەو ئافرەتەیە بەناوی سەهەند کە خاوەنی منداڵێکی تەمەن یەک ساڵە بە ناوی سیما، ئەو دایکە سیمای زۆر خۆش دەویست و رۆژانە خۆی بە قوربانی دەکردو یاری لەگەڵدا دەکرد، دایکی سیما رۆژێکیان لە ناکاو دوچاری ژانی گورچیلە دەبێت، دکتۆر پێی دەڵێت تۆ پێویستت بە نەشتەرگەرییە، دایکی سیما رازی دەبێت و رۆژی بۆ دیاری دەکرێت بۆ ئەنجام دانی نەشتەرگەرییەکە، چەند رۆژێک بەر لە تەواوبوونی کاتەکە سەهەند خان لە لای شیلانی دەستە خوشکی باسی نەخۆشیەکەی خۆی دەکات، شیلانیش دادەنیشێ دەست بە قسان دەکات و دەڵێت خوشکم خودا شفات بدات و سەبرت هەبێ و کچێ بە قسەی دکتۆری مەکە باوەڕ بکە خوشکم زۆرکەس بەو بەنجەی کە دەکرێت پێش نەشتەرگەری بەخۆ نەهاتوونەتەوە و مردییە، سەهەندیش لەبەر ئەوەی منداڵەکەی خۆی زۆر خۆش دەوێت بە قسەکانی باوەڕ دەکات و لە مێشکی خۆی بە جوانی خەزن دەکات رۆژانە ئەو قسانە لە مێشکی خۆی دووبارە دەکاتەوە، هەر جارەک لە خەیاڵی خۆیدا دوای نەشتەرگەری بیرۆکەی مردنی خۆی دێتە پێش چاو هەر بەخۆی دەڵێت باشە من بمرم کێ ئاگای لە منداڵەکەم دەبێت و خواردنی دەداتێ و لە سەرماو گارمای دەپارێزێ بەبێ ئەوەی بیری ئەو شەوانە بکاتەوە کە خەوی لێ کەوتوەو بەیانییەکەی بەخەبەر هاتووە وەک ئەو بەنجەی کە پێش نەشتەرگەری لێی دەدرێت و هێشتا نەمردووەو لە ژیاندایە، لە دوای ئەم قسانە دڵی توند دەبێت و غەم دای دەگرێت و دەست بە گریان دەکات، رۆژ دێت و دەروات وادەی



نەشتەرگەرییەکە دێت دایکی سیما دەڵێ: بە خوا من ئەم نەشتەرگەرییە ناکەم هەرچەند هەوڵی لە گەڵ دەدەن بەڵام بێ سودە بە هەر حاڵ دواتر نەشتەرگەرییەکەی بۆ دەکرێت، بەڵام ترسی مردن لە مێشکی چەسپیوە و هەرکاتێک بیری مردن دەکاتەوە دوچاری دڵ تەنگی و بێزاری دەبێت.

بە داخەوە لە وڵاتی ئێمەش هەتا ئێستا خەڵکانێک هەنە تووشی ژانە سەر بوون پەنا دەبەنە بەر نوشتەو شێخ و مەلایان، دایکی سیما وەک ئەو خەڵکە ناچار سەردانی شێخێک دەکات باسی دڵ توندی و بێزاری خۆی لە لا دەکات بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە دەرونییەی نەمێنێت، یەکێکیش بە ناوی شێخ بە بێ ئەوەی لە روی دەروونی و زانستی چارەسەری بۆ بکات و لێی بکۆڵێتەوە هەر وەک نەخۆشەکانی تر نزیکەی چل دار لە ژێر قاچی دەدات و بڕێکی باش پارەی لێ وەردەگرێت و بە رێی دەکات، بەڵام هەرچاک نابێت، لە کۆتایدا من دەڵێم خوێنەران ئێوە بڕیار بدەن ئایا چارەسەر کردنی ئەم نەخۆشە لێدان و خواردنی دەرمانە یان پێویستی بە رێنمایی دەروونی و تێگەیاندنی مانای مردنە، یان راستی ئەم حاڵەتەی بۆ روونبکرێتەوە بۆ نەهێشتنی ترس و دڵەڕاوکێ؟ یان لێدانی دار لە ژێر پێی؟

## خرۆشانی هزر و ئاسوودەیی دەروون

فەرهاد عەلی مەولود

هەر کە وەرزی بەهار دێ دەشتودەر بۆ ئێمەی مرۆڤ دەرازێندرێتەوە، ئەم سروشتە جوانە هەستی مرۆڤ دەخرۆشێنێت و دەیبات بۆ لای خۆی، ئەم بردنە بۆ لای خۆی بۆ ئەوەیە کە ئێمە هزرمان فراوان بێت و دەروونمان ئاسوودەبێت و دروستکاری بەتوانای بوونەوەرمان بە بیر بێنێتەوە، ئێمەش سوپاس گوزاری بەدیهێنەری بوونەوەر بین.

ئەگەر ئێمە بچینە دەرەوە و چەند ساتێک دەروازەی هزر و دڵمان واڵا کەین بۆ ورد بوونەوە و سەرنجدان لە گوڵێک و نەمامێک و رووەکەکانی دی و زیندەوەرانی چەشنی پەپوولە و هەنگ و باڵندەکان و هتد... هزرمان فراوان دەکات و دڵمان ئاسوودە دەبێت، ئەو کات دەزانین کە بۆچی هاتووینە دەرەوە بۆ گەشت و گوزار و ئەوکات مانای چوونە دەرەوە دەزانین، هەریەک لەو بەدیهێندراوانەی کە دەیانبینین لەو چوونە دەرەوە خۆشەویستیمان بۆ بەدیهێنەری بە توانا و کاربەجێ زیاتر دەبێت، ئەو کات لە جێگەی ئەوەی کە دار و درەختەکان بشکێنین خۆشمان دەوێن و دەیان پارێزین، لە جێگەی ئەوەی ئازاری باڵندە و زیندەوەران بدەین خۆشمان دەوێن، لە جێگەی ئەوەی بێ فەرمانی بەدیهێنەری بوونەوەر بکەین گوێرایەڵ و سوپاس گوزار دەبین، بەم جۆرەش ئاسوودە و بەختەوەر دەبین.

ئەم لایەنەی تیشکمان خستە سەر لایەنێکی زۆر گرنگە و پێویستە گرنگی زۆری پێ بدەین، لایەنێکی تریش هەیە پێویستە لە یادی نەکەین ئەویش، چونکە پاراستنی کەل و پەلەکان پاک دەبێتە تەواوکەری ئەو ئاسوودەیی و بەختەوەرییەی کە لە سەرەوە باسمان کرد، پاک ئەوە هۆکارێکی گرنگە بۆ پاراستنی لایەنی تەندروستی و ژینگەیی بۆیە پێویستە زۆر گرنگی پێبدەین، بۆیە ئەمەش ئەرکی هەموومانە و هەموومان لێی بەرپرسیارین، ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین کە لە لایەن هاوڵاتیانەوە پشت گوێ خراوە، بەڵام ئەگەر پشت گوێی نەخەین و گرنگی پێبدەین بە ماندووبونێکی زۆر کەم هەم کەل و پەلەکان دەپارێزین و هەروەها شوێنەکان پاک و خاوێن رادەگرین، بێگومان بە بیرکردنەوە و ورد بوونەوە ئاسوودەیی دەروون و تەندروستی جەستە و پاکی ژینگەمان بە دەست دێنین، بەم کارەش خۆمان و وڵاتمان بەرەو پێش دەچێت و دەبینە کەسێکی سوودبەخش و دڵسۆز بۆ هاوڵاتیان و وڵاتمان.

کابرایەك مەڕەکی کردە قوربانی گوتی: دەیکەمە خێر لۆ دایك و باوکم و خوشکم لە سوید و لۆ خاڵم لە ئەڵمانیا، قەسابەکە گوتی: باشە ئەتوو قوربانی دەکەی یا گۆرانی داوادەکەی.





# کێشەو خاوەنەکەی!
# یان کێشەو چارەسازی

له روانگەی هەڵسەنگاندنی مرۆڤ بۆ کێشه تەنها دوو دید هەیه: یەکێکیان به ئەرێنی (ایجابي) سەیرکردنێتی، که لەگەڵ پێکهاتنی کێشه بیر له چارەسازی بکرێتەوە، ئەوەی دیکەیان به نەرێنی (سلبی) سەیری بکرێت و ویستی چارەسازی تێیدا بمرێندرێت، و له کۆتادا ئەو زاڵ ببێ بەسەر خاوەنەکەی.

لۆ ئەوەی زانستیانه سەیری هەر کێشەیەک بکرێ چەند خاڵەک هەیه دەستنیشانی دەکەین:

- هەستکردن به کێشه به چ دید و تێڕوانینەک تەماشای کێشه دەکرێت؟
- ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر گیروگرفتەکان به شێوەیەکی زانستییانه.
- لەدوای توێژینەوە، چەندەها چارە(حل)ی له بۆ دابنرێ.
- توێژینەوە لەسەر ئەو چارانه دەکرێت، که کێهانیان گونجاو (انسب) ترن لەبۆ چارەی ئەو کێشەیه یان ئەو گرفتەیەی.
- ئەو چارەیه دادەبەزێنرێ (تنزیل) دەکرێ لەسەر ئەو کێشەیەی که هەیه.
- بەدواداچوون لۆ ئەنجامەکانی دەکرێت.



بوونی کێشه بەڵگەی ئەوە نییه که ئەو ئینسانه به هەڵە داچووە، ئینەما کێشه یەکێک لەو پاڵنەره به قووەتانەیه وەلە ئینسان دەکا که لەبۆ بەهەشتی بچی، هەست بەوەی بکا ئەوەی کردیتی، یان ئەوەی کرایه پێداچوونەوەی دەوێ.

به تێڕوانین(رؤية)ی ئینسانەکەی لۆ کێشەکە.. کێشەکە دەگۆڕێ، ئەو ئینسانه له خود(ذات)ی خۆی له ناخی خۆی به زانین(معرفة) و رۆشنبیری زانست و درککردن و تێگەیشتنو ئەزموونەکانی ژیان ئەوانه هەمووی دەبنه زەمینه لەبۆ تێڕوانین(رؤية)ی ئینسانەکەی، ئایا (رؤية)ی ئینسانەکه لەبۆ کێشه نەرێنی یان ئەرێنیی-ه، تێڕوانینیان لەبۆ کێشه وادەکا کو مامەڵه لەگەر کێشەکه دەکەن)؟



محمد رافع

له رۆژگاری ئەوڕۆماندا کێشه ئەوەندە زۆر بووە بوویتە بەشێک له ژیانماندا، لۆیەش خەڵکی چەندەها بیرۆکەی جیاوازیان هەیە لۆ چۆنیەتی رەفتار لەگەڵ خۆیان و یەکتری لەکاتی دروست بوونی کێشه و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی:

- هەیانه دەڵێ: بوونی کێشه هەلێکه (فرصة)، واته کاتەک کێشەی بەرەورووی دەبێتەوە له هەمان کاتدا وای دەبینی که هەلێکی تێدایه، جا زیرەکی ئەو وا دەکات که چەند سوود لەو کێشەیه وەربگرێ و به قازانجی خۆی کۆتایی پێ دێنی.
- هەشیانه دەڵێ: به جۆر و ئاستی کێشه، خۆم دەناسم!
- هەشه دەڵێ: ئەوکات من هەست به کەسایەتی خۆم دەکەم که له کێشەی خەڵکانی تر(غەیره) بژیم، کامەرانیشم لەوە دایه که بتوانم بۆی چارە بکەم.

بەڵام له هەمووی گرنگتر ئەو کەسەیه که ژیانی خۆی تەرخانکردبێت لۆ چارەسەرکردنی کێشەو گیروگرفتەکانی خەڵکی، هەردەم هەوڵ و تەقەلای له پێناو شتێکه و ئاسوودەیی ئەویش له ئاسوودەکردنی گشت خەڵکی سەر زەمینه.